# شیعەگەری



## تێکۆشانە یان گومڕایی؟!





دکتۆر
ڕاغب سیرجانی

# شیعەگەری

# تێکۆشانە یان گومڕاییی؟!

نوســینی

دکتۆر ڕاغیب سیرجانی

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ﴾ (الزمر: ١٨).

خوێنەری ڕێزدار خودا (عزوجل) ئەم نیعمەتەی به خەلکی کوردستان بەخشیوە کە یەك پارچە موسلمانە و ئەهلی قورئان و سونەتە، بەڵام زۆربەمان دەزانین کە ناحەزان خەریکی ئەوەن تۆیی دوو بەرەکی بخزێننە ناو یەك پارچەیی بیرو باوەڕی موسلمانانی کوردستان، تاوەکوو ئەم گەلەش وەکوو گەڵەکانی یەمەن و بەحرێن و سوریا و عێراق دابەشی دوو تایەفەی مەزهەبی ببێت بۆ دوو ئامانج؟

یەکەم: دابڕانی کورد لە ئایینی ئیسلام.

دووەم: کێشەی کورد نزۆك ببێت و میراتەکەی بۆ ئەملاو ئیملا بڕوات، کەواتە ئەرکە هەمووومان بەتایبەتی زانایان و بەرپرسان و رۆشەنبیران کار لەسەر مانەوەی یەك پارچەیی بیرو باوەڕی هەموو دانیشتوانی کوردستان بکەین،

بەلام بەداخەوە ئیش کردن بۆ ئەم مەبەستە گرنگ و پیرۆز زۆر لاوازە، بەڵگەش، دەمێك بوو ئەم کتابە لەلایان برایێکەوە ئامادە کرابوو بۆ چاپ، بەلام بەهۆی شەرم و شتی لەم شێوەیە چاپکردنی ئەم کتابە زۆر دواکەوت، بۆیە نازانین بەچ شێوەیەك لۆمەی ئەو کەسانە بکەین کە (جورئەت) و باوەڕیان وایە نابێ عەیب و عاری خاوەن بیرو باوەڕە تاعوونیەکان باس بکرێت، بەداخەوە دەلێین خاوەن بیرو باوەڕە چەوتەکان زۆر بە جدی و بە جورئەتەوە ئیش بۆ بیرو باوەرە بێ بنەماکانیان دەکەن، بەلام هەر وەکوو لە سەرەوە ئاماژەمان پێ کردوە کە ئێمەی موسڵمانی خاوەن بیرو باوەڕی قورئان و سونەت بە هۆی کلاو گرتن و بیر کردنەوەی نا تەندروست بەڵێ ناتەندروست بۆمان ناکرێ ڕوو بە ڕووی بیرو باوەڕە سەرەتانیەکان ببینەوە.

**(عبدالرزاق عبدلله)**

**٢٠ / ١٠ / ٢٠١٥**

# پێشــەکی

زانایانی زانستی ئوسول دەفەرموون: "بڕیار یان حوکم دان لەسەر شتێك بەشێکە لە تەسەورکردن و وێناکردنی ئەو شتە." بەواتایەی کە من ناتوانم بڕیار لەسەر شتێك بدەم بەبێ وێناکردن و تێگەیشتن لەو شتە، بۆیە بڕیاردان لەسەر شیعەکان هیچ مانایەکی نییە بەبێ ئەوەی شیعەکان بناسین، بەهەمان شێوە بەڵگەهێنانەوە بەبیروبۆچوون سەبارەت بە لێکنزیکردنەوەی سوننە و شیعەکان بێمانا دەبێت، ئەگەر بێتوو سروشتی هەردوولا نەزانین، بەهەمان شێوە پەسەند یان ڕەتکردنەوەی دەرگای باسکردنی شیعە، بەبێزانینی ڕاستی و ئاستی ترسناکی و گرنگی و پەیوەندی باسەکە بەو گۆڕانکاریە جۆراوجۆرانەی ئەم ئوممەتە پێیاندا گوزەردەکات.

زۆربەکورتی بەرلەوەی ڕەخنە لە هێرش بەران یان بەرگری کارانی سەرشیعەکان بگرین، سەرەتا پێویستە بزانین، شیعەکان کێن؟ و ڕەچەڵەکیان چیە؟ و پاشخان و باکگراوندی بیروباوەرو فیقهی شیعەکان چییە؟ و واقیعیان چییە؟ و مێژوویان چییە؟ و ئامانج و مەبەستشیان چییە؟

ئەوکات بیروڕای خۆمان لەسەربنەمایەکی روون دەردەبڕین زۆرکەس بیروڕای بەتەواوی گۆڕاوە و وازی لەڕاوبۆچوونی خۆیی هێناوە

کاتێك زانیاری و بۆچوونی ڕاست و دروست و ڕوونی پێگەیشتووە.

لەپاشان زۆر پرس و بابەت هەن سەبارەت بە شیعەکان کەهەموو بەیانێك هەرلەگەڵ کردنەوەی چاوەکانماندا بەرچاومان دەکەون و ناشتوانین خۆشمانیان لێ لەگێلی بدەین و لێیان بێدەنگبین...

بۆنموونە، ئەو پرس وبابەتانەی لە ئارادان: پرس و بابەتی حیزب الله (ی لوبنانی) و پرس و بابەتی حوکمڕانیەتی لەئێرانداو شیقە شیقی- تەنها بە قسەی- نێوان ئەمریکا و ئێران، پرسی حوسیەکانی یەمەن...

هەموو ڕۆژێك هەواڵ و ئەخباری ئەم پرس و باسوخواسیان دەخوێنینەوە و ناشتوانین بەبێ زانست و بەرچاوڕوونی سەبارەت بە شیعەکان مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین، جا لەبەر ئەمە ئەم چەند ووتارەم کۆکردۆتەوە، کە پێشتر سەبارەت بە مەسەلەی شیعەکان نوسیبوومەوە، لەم کتێبە بچوکەدا بڵاوم کردۆتەوە، کە ئامانجم تێیدا ئاشناکردنی خوێنەرە سەبارەت بە ڕای خۆم دەربارەی مەسەلەی شیعەکان، ئەگەرچی، بێگومان، مەسەلەکە پێویستی بەڕوونکردنەوەیەکی زیاتر و دوورودرێژتر هەیە، ئەویش بەپشتیوانی و ئیزنی خوا، بریتییە لە دەرچوونی پەرتووکی "چیرۆکی شیعەکان" کە پەیمان بە خوینەران دەدەم، لەم نزیکانە دەگاتە بەردەستیان ئینشاالله، کەبە دوورو درێژی و بەرفراوانی تاوتوێی مەسەلەی شیعەکان دەکات.

خوای گەورە ئاگاداری مەبەستەکانە، و

هەرئەویش ڕێنمونیکاری ڕاستەشەقامیشە..

پرۆفیسۆر .ڕاغیب سیرجانی

# ڕەچەڵەکی شیعەکان

لەڕاستسیدا کێشەکە کێشەی نەتەوەیەك نییە کە لەوڵاتێك لە وڵاتەکاندا دەژین، کە هەندێك کێشەیان لەگەڵ وڵاتێکی دراوسێیاندا هەبێت بەڵکو ئەو کێشەیە ڕەگوریشەیەکی بیروباوەری و فیقهی و مێژوویی هەیە، کە هەردەبێت بگەرێنەوە سەریان.

مێژوونوسان سەبارەت بە سەرەتایەکی راست و دروستی شیعەکان راوبۆچوونی جیاجیان هەیە، ئەو ڕایەی کەلەلای خەڵکی باوە، ئەوەیە کە شیعەکان بریتین لەو کەسانەی کە پشتیوانی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب (رضي الله عنه) یان کرد، لەکاتی ناکۆکییەکەی لەگەڵ موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیاندا (رضي الله عنه)، بەڵام ئەمەش ئەوە دەگەیێنێت کەشوێنکەوتووەکانی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب (رضي الله عنه) شیعە بووبن و شوێنکەوتووەکانی موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیانیش (رضي الله عنه) سوننی بووبێتن. هیچ کەسێك قسەی واینەکردووە، سوننەکان بڕوایان وایە کە لەو ناکۆکییەی نێوان ئەم دوو هاوەڵە بەرێزەدا روویان دا، ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) لەسەر حەق بوو، موعاویەش (رضي الله عنه) هەوڵیدا (ئیجتیهادیکرد)

بەڵام ڕاستییەکەی نەپێکا. ڕای سوننەکان سەبارەت خۆدانەلای ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی تالیب (رضي الله عنه) لەسەر ئەم ناکۆکییە ڕوون و ئاشکرایە. پاشانیش ئەو بیرو بنەما و باوەڕانەی کە شیعەکان باسیان لێوەدەکەن هەرگیزاوهەرگیز بریتی نەبووە لەبیروڕا و بنەماکانی ئیمامی عەلی (رضي الله عنه)، بۆیە هەرگیز دروست نییە بگوترێت: سەرەتایی شیعەکان بۆ ئەو سەردەمە دەگەڕێتەوە.

هەندێك لەمێژوونووسان دەڵێن: سەرەتای شیعەکان دەستپێدەکات لە دوای شەهید کردنی (هاوەڵ و ئیمامی بەرێز) حوسەینی کوڕی عەلی (رضي الله عنهم). ئەم رایەش زۆر راست و دروستە: ئیمامی حوسەین لەدژی حوکمڕانی یەزیدی کوڕی موعاویە هەڵسایەوەو ڕووی کردە عێراق دوای ئەوەی هەندێك خەڵکی عێراق داوایان لێکرد وپەیمانیان پێیداکەسەری بخەن، بەڵام لەساتەوەختەکانی کۆتاییدا پشتیان تێکرد، ڕووداوەکە بەم شێوەیە بوو کاتێك ئیمامی حوسەین (رضي الله عنه) لە شاری کەربەلا شەهیدکرا، ئەوکۆمەڵە خەڵکەی کە داوایان لێکردبوو بێتە عێراق تووشی پەشیمانی بوون و بیریان لەتاوانەکەیان کردەوە بۆدەرچوون لەم تاوانەکەیان، دواتریش لەدژی حوکمڕانی ئەمەویەکان بەکردارەکی هەڵسان و ژمارەیەکیان لێکوژرا، ئەم کۆمەڵەیە بە شیعەکان ناسران. ئەم ڕووداوەش توندی و پەیوەستی شیعەکان بە ئیمامی حوسەین (رضي الله عنه) نیشان دەدات، پەیوەستەیەکەیان بۆ ئیمامی حوسەین زیاترە تاوەکو بۆ ئیمامی عەلی باوکی (رضي الله عنه)، هەروەکو هەمووڵامان دەزانین، شیعەکان یادی شەهیدکردنی ئیمامی حوسەین(رضي الله عنه) دەکەنەوە،

بەڵام یادی شەهیدکردنی عەلی کوڕی ئەبی تالیب(ڕەزای خوای لێبێت) ناکەنەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا، دروستبوون و سەرهەڵدانی ئەم گرۆیە هیچ نەبوو تەنها دەرکەوتنی گروپێکی سیاسی رامیاری نەیار و سەرخستنی بیرۆکەی ڕاپەرین لەدژی حوکمڕانی ئەمەوییەکان نەبێت، ئەم کۆمەڵەیە هیچ بیروباوەری یان مەزهەبی یان فیقهی نەبوو کە جیابێت لەوەی سوننەکان، بەڵکو لەمەولا دەبینین کە چۆن ئەو سەرکردانەی سەردەمی زوو، کە شیعەکان بەگوتەی خۆیان بە پێشەوا یەکەمەکانی خۆیان دادەنێن، پیاوی سوننە نەبێت چیتر نەبوون، قسەوڕایان هەموو لەسەر بیروباوەر و بنەماکانی سوننە بووە.

دوای تێپەربوونی یەك مانگ بەسەر شەهیدکردنی ئیمامی حوسەین (رضي الله عنه) کەش وهەواکە بەشێوەیەکی ڕێژەیی هێور بووەوە، لە ماوەیەکدا عەلی زەینولعابیدین کوڕی حوسەین (رضي الله عنهم) بەدیار کەوت، کە لەچاکترینی خەڵك و زانایانی دونیانەویست بوو، و هیچ ڕا و بیروباوەڕ و فیکری لێبەدی نەکراوە کە جیاواز و ناکۆك بێت لەبیرو باوەڕی صەحابە و تابیعیەکان. عەلی زەینولعبیدین دوو کوڕی گەورەوی پلەوپایە بەرزی هەبوو لەروی لەخواترسی و دونیانەویستییەوە، ئەوانیش بەناوەکانی موحەممەدی باقرِ و زەید بوون، ئەم دووانەش بەتەواوەتی لەسەر هاوڕا و ڕێبازی زانا سوننەکانی سەباحە و تابیعیەکان بوون، تەنها ئەوەندە نەبێت زەیدی کوڕی عەلی (رضي الله عنه) بۆچوونی جیای هەبوو سەبارەت بەوەی کە ئیمامی عەلی کوڕی ئەبوتالیب (رضي الله عنه) شیاوترو لەپێشتر بووە لە

ئیمامی ئەبوبەکری سدیق(رضي الله عنه) بەوەی پۆستی جێنیشینی وەرگرتایە، ئەو ئەگەرچی بەم ڕایەی پێچەوانەی کودەنگی زانایان و پێچەوانەی زۆر فەرموودەی کردوە کە بەڕاستەوخۆی پلەوپایەی ئیمامی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان بەرزدەکەنەوە بەسەر پلەوپایەی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبوتالیب (رەزای خوا لەهەموویان بێت)، ئەمەش ناکۆکی و جیاوازیەکی بیروباوەری نییە، چونکە زەید بەڕێزەوە سەیری چاکە و گەورەیی سێ خەلیفە راشیدینیە یەکەمەکان دەکات، بەڵام ئەوە نەبێت ئەو ڕای وایە کە ئیمامی چاکتر و شیاوتر بوو لەوان، هەروەها دەشیگوت دەشێت لەگەڵ بوونی باشترین کەس کەسێکیتر ببێت بە پێشەوا، بەڕایەی نکۆڵی لە پێشەوایەتی ئیمامی ئەبوبەکری سدیق و عومەر و عوسمان (رضي الله عنهم) ناکات، بەڵام جگە لەم خاڵە لەگەڵ سوننەکان لەسەرهەموو بیروباوەڕو بنەماکانیان هاوڕاو کۆکە لەگەڵیاندا.

زەیدی کوڕی عەلی بەڕاپەڕین هەڵسا لەدژی خەلافەتی ئەمەویەکان، ئەمەش بەدووبارە کردنەوی هەمان تاقیکردنەوەی ئیمامی حوسەینی کوری عەلی باپیری (رضي الله عنهم)، ئەم روداوەش لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك بوو، ئەم راپەرینەش بە کوشتنی زەید لەساڵی ١٢٢کۆچی کۆتایی هات. شوێن کەوتوەکانی زەید هەڵسان بەدامەزراندی مەزهەبێك لەروانگەی بیروڕاکانی ئەوەوە کەلەمێژوودا بە مەزهەبی زەیدی ناسراوە، ئەمەش لەبەر ناوی ئەوەوەیە. ئەم مەزهەبە ئەگەرچی بەیەکێك لە مەزهەبەکانی شیعە دادەنرێت، بەڵام لەهەموو شتێکدا هاوڕایە لەگەڵ سوننەکاندا،

تەنها لەسەر بەباشتردانانی ئیمامی عەلی نەبێت لە ئیمامی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان (ڕەزای خوا لەسەر هەرچواریان بێت)، شوێنکەوتووانی ئەم مەزهەبە لە وڵاتی یەمەندا بڵاوبوونەتەوە. زەیدەیەکان نزیکترین مەزهەبی شیعەکانن لە مەزهەبی سوننی، تەنانەت هەندێك جار هیچ جیاوازیشیان لەگەڵ سوننەکاندا لێبەدی ناکرێت.

ئەوەی شایەنی باسیشە ئەوەیە، هەندێك لە شوێنکەوتووەکانی زەید کوڕی عەلی سەبارەت بە ئیمامی ئەبوبەکر و عومەر(ڕەزای خوایان لێبێت) پرسیاریان لێیکرد، ئەویش ڕەحمەتی بۆناردن (واتە بەچاك باسیکردن)، بەڵام ئەوانەی لەکۆمەڵەی زەیدیەکان جیابوونەوە ڕەتیانکردەوە کە ڕەحمەتیان بۆ بنێرن، لەمێژوودا ئەوانەش بە ڕەتکەرەوەکان (الرافضة) ناسراون، چونکە پێشەوایەتی دوو گەورە پیاوی وەکو ئیمامی ئەبوبەکر و ئیمامی عومەر (ڕەزای خوایان لێبێت) یان لەلایەك و لەلایەکی ترەوە ڕای زەیدی کوڕی عەلی شیان ڕەتکردەوە، لەوانیشەوە کەسانێك پەیدابوون، مەزهەبی دوازدە ئیمام (الاثنا عشریە) یان دامەزراند، کە بە گەورەترین مەزهەبی شیعەکان دادەندرێت.

موحەممەد باقر، هەشت ساڵ پێش زەیدی برای (لە ساڵی ١١٤ کۆچیدا) کۆچی دوایی کرد، وکوڕێکی شەرعزان و بلیمەت و خاوەنشکۆی لەدوای خۆی، بەناوی جەعفەری سادق، جێهێشت، کە هاوڕا و کۆك بوو لەگەڵ صەحابە و تابیعی و زاناکانی ئیسلامدا.

لەکۆتا ساتەکانی خەلافەتی ئەمەویەکاندا، بزوتنەوی عەبباسییەکان بەچالاکییەك بۆ کۆکردنەوی خەڵك بەمەبەستی ئەنجامدانی کودەتایەك لەدژی حوکمڕانی ئەمەوییەکاندا، ئەم بزوتنەوەیە هاریکاری

ئەوکۆمەڵانەیان کرد کەلە زەیدی کوری عەلیدا جیابووبوونەوە، لەساڵی ١٣٢ی کۆچیدا روخاندنی خەلافەتی ئەمەوییەکان کۆتایی پێهات. خەلافەتی عەبباسییەکان بەسەرکردایەتی ئەبوعەبباسی سەففاح، دواتریش لەلایەن ئەبوجەعفەری مەنسورەوە، پێکهێنرا، هاوکارەکانی ئەم بزوتنەوەیە هەستیان بەبێ هیوای کرد، چونکە دەیانویست فەرمانڕەوایەتییەکە بۆیەکێك لە نەوەکانی خانەوادەی عەلی کوڕی ئەبی تالیب(رەزای خوای لێبێت) بووایە. بۆیە سەرلەنۆی هەڵسان بەئەنجامدانی کودەتایەك بۆسەر خەلافەتی عەبباسیەکان، بەهۆی ئەمەشەوە کۆمەڵەی "تالیبیەکان" یان پێکهێنا، لەبەر ناوی عەلی کوڕی ئەبوتالیب (رەزای خوای لێبێت)،ئەمەش لەدژی عەبباسیەکانەوە بوو کە دەدرانە پاڵ عەبباسی کوڕی عەبدول موپەڵیبەوە(رەزای خوای لێبێت).

تائەوختەش، هیچ جیاوازی و ناکۆکییەکی بیروباوەری و فیقهی (لەنیوان شیعە و سوننەکاندا) لەئارادانەبوو، تەنها سەبارەت بە پێشەوایەتی ئیمامی ئەبوبەکر و عومەر (رەزای خوایان لێبێت) نەبێت، چونکە چینێك لەوانەی کەلە زەید کوڕی عەلی جیابووبوونەوە و پێشەوایەتی ئیمامی ئەبوبەکر و عومەر (رەزای خوایان لێبێت) یان رەتدەکردەوە و بەئاشکرا نەفرەتیان لێدەکردن.

لەساڵی ١٤٨ ی کۆچیدا جەعفەری سادیق کۆچی دوایی کرد، و کوڕیکی زاناودانای بەناوی موسای کازم لەدوای خۆییدا جێهشت، بەڵام لەرووی زانستەوە لەئاستی باوکی نەبوو، ئەویش لەساڵی ١٨٣ ی کۆچیدا وەفاتی کرد، و کۆمەڵێك منداڵی لەدوای خۆیدا بەجێهێشت، یەکێك لەوانە ناوی عەلی رەزا بوو.

لەڕاستیدا خەلیفەی عەبباسی بەناوبانگ، مەئمون لەئاژاوەی تالیبییەکان تێگەیشتبوو، داوایان دەکرد حوکمڕانی بدرێت بە یەکێك لەنەوەکانی عەلی کوڕی ئەبوتالیب (رەزای خوای لێبێت)، نەك بە یەکێك لەنەوەکانی عەبباس (رەزای خوای لێبێت)، بۆیە عەلی رەزای کرد بە ئەمینداری خۆی، ئەمەش بوو بەمایەی ناکۆکییەکی زۆر لەنێوان عەبباسییەکاندا، ئەوەندەی پێنەچوو لەناکاو عەلی رەزا لەساڵی ٢٠٣ی کۆچیدا وەفاتی کردو سەرلەنۆێ شۆرشی شیعەکان لەدژی عەبباسیەکان، هاوشێوەی ئەمەویەکان، دەستی پێکردەوە.

چەند ساڵێك تێپەربوو، ڕەگی شۆرش هێوربووەوە تائەوکاتە هیچ مەزهەبێکی شیعی سەربەخۆی ئایینی نەبوو کەبە شیعەمەزهەب ناسرابێت، تەنها بزوتنەوەی سیاسی نەبێت، تاکە ئامانجیان گەیشتن بە حوکمڕانی و بەرستیکردنی بەردەم حوکمڕانی نەبێت هیچیتر نەبوو، ئەمەش بە بیانووی جیاجیا، کە هیچ لەو بیانوانە هۆکاری ئەو بیروباوەڕیانەی لە پشتەوە نەبوو کە ئێستا لە ڕێبازی شیعەکانی ئەمرۆدا هەن.

ئەوەی شایەنی سەرنج بێت ئەویە، ئەم بانگهێشانەی کە بەمەبەستی جیابوونەوە لەدەسەلآت دەیانکرد، دەنگدانەوەیەکی فراوانی لێکەوتەوە لەهەرێمی فارس (ئێرانی ئێستا)دا، زۆربەی خەڵکی ئەو هەرێمە بەدرێژای ئەو چەند ساڵانە هەستیان بەداخ و پەژارەیەکی زۆر دەکرد لەبەر روخانی ئیمپراتۆریەتی فارسی و توانەوەی لەناو دەولەتی ئیسلامیدا، فارسەکان خۆیان بەبەرزتر دەزانی لە رووی پلەوپایە و رەچەڵەکدا، و مێژووی خۆشیان بە کۆن و گرنگتر دەزانی لە مێژووی موسوڵمانانداا،

بۆیە شتێکیان لەناودا پەیدا بوو کە بە "شعوبیە" ناسرابوو (واتە گەل پەرستی)، کەبریتی بوو لە دەربڕنی ئینتیماو سۆزو خۆشەویستی بۆ گەلێك نەك بۆ ئاینی ئیس https://www.facebook.com/profile.php?id=100006974058737 لام، هەندێکیان خۆشەویستیەکی کوێرانەیان بۆ رەچەڵەکە فارسیەکەی خۆیان بەهەموو شتەکانییەوە هەبوو، تەنانەت ئەو ئاگرەی کە دەشیانپەرست لەکاتی خۆیدا. چونکە بەتەنیا توانای دەرچوون و ڕاپەرینیان لەدژی خەلافەتی ئیسلامی نەبوو، و دەیان ساڵیش بوو موسوڵمان بووبوون، بۆیە شورشی تالیبیەکانیان بەچارەسەرێکی ئەڵتەرنەتیڤی باش زانی و چوونە پاڵیانەوە بەمەبەستی روخاندنی ئەو دەوڵەتە ئیسلامیەی کە پێشتر دەوڵەتە فارسیەکەی ئەوانی روخاندبوو، لەهەمان کاتیشدا وازیشیان لەو ئیسلامەش نەدەهێنا کە دەیان ساڵ بوو لەئامێزی خۆیانیان گرتبوو، بەڵکو هەوڵیان دەدا بەگوێرەی هەواوئارەزو و کەلتوری فارسی خۆیان دەستکاری بکەن، بۆئەمەش کەڵکیان لەو بارەشلەژاوەی ناوخەلافەتی ئیسلامی وەرگرت، بەڵام خۆشیان لە لوتکەی ئەم هەرەمەدا دانەنا، بەڵکو لەرێگەی ئەو تالیبیانەوە هاتن کە ئینتیمایان بۆ عەلی کوڕی ئەبو تالیب (رەزای خوای لێبێت) هەبوو و بەشێك بوون لە ئالوبەیت و خانەوادەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، خاوەنی پلەوپایە بوون لەناو دڵی خەڵکیدا، ئینجا لەپاشانیشدا ئەم بانگهێشەو ئیدیعاکردنە بەردەوام دەبێت.

ئا بەم شێوەیە هەوڵ و تەقەللای شوعوبیە فارسەکان لەگەڵ چینی تالیبیەکانی ئالو بەیت یەکیگرت بەمەبەستی پێکهێنانی

قەوارەیەکی سەربەخۆی نۆی، بەشێوەیەك نەك تەنها سیاسی بێت بەڵکو قەوارەیەکی ئاینیش بوو.

دێینەوە سەر باس و خواسی تالیبیەکان، دەبنین لەدوای وەفاتکردنی عەلی رەزا، کە خەلیفە مەئمون کردبوویە ئەمینداری خۆی، کورێکی عەلی بەناوی موحەممەدی جەواد دەرکەوت کە لە ساڵی ٢٢٠ی کۆچیدا وەفاتیکرد، دوای ئەویش کوڕێکی بەناوی عەلی کوڕی موحەممەدی هادی دیارکەوت لەساڵی ٢٥٤ی کۆچی وەفاتیکرد، دواتریش لەکۆتایدا حەسەنی کوڕی عەلی ناسراو عەسکەری بەدیارکەوت کەلەناکاو لە ساڵی ٢٦٠ی کۆچیدا وەفاتیکرد، و تەنها کورێکی بەناوی موحەممەد جێهێشت کە تەمەنی ٥ ساڵ بوو. لەماوەی هەموو ئەو ساڵانەی پێشوودا، ئەم بزوتنەوانە تەنها بزوتنەوەی جیابونەوەیی بوون، کە دوو بەشی لەخۆگرتبوو: بەشیکی لە ئالوبەیت، بەشێکیش لە شوعوبیە فارسەکان. سەرکردایەتی ئەم بزوتنەوانەشیان دەدایە دەست هەریەك لە کورەگەورەی سەرکردەی تالیبیەکان، کەلە عەلی رەزا وە دەستپێدەکات و بە حەسەنی عەسکەری یش کۆتایی دێت. بەڵام ئەوانەی لەپێش عەلی رەزا دا هاتن، بۆ نمونە موسای کازم ی باوکی،یان جەعفەری سادق ی باپیری،یان موحەممەد باقر ی باوکی باپیری، هیچیان پێشەوایەتی شۆرشیان لەدژی فەرمانڕەوایەتی ئەمەوی و عەبباسی دا نەکردووە. بەڵام دوابەدوای وەفاتی حەسەنی عەسکەری لەساڵی ٢٦٠ی کۆچیدا، ئەم شۆڕشگێڕانە کەوتنە ناو سەرگەردانیەکی گەورەوە، باشە دەبێت کێ بێت پێشەوایەتیان بکات، لەکاتێکدا حەسەنی عەسکەری کورێکی

بچوکی لەپاش خۆیدا جێهێشتبوو (نۆبختی لە (فرق الشیعة) لە (لاپەرە ( ١٠٨) دەڵی حەسەنی عەسکەری کوری نەبوو)، واتە نەبوونی کور یان مردنی لەناکاوی ئەم کوڕە کێشەکانی زیاترکرد، ئەمە بوو بە مایەی لەتلەت بوونی شۆڕشگێڕەکان بۆ چەند گروپ ودەستەی زۆر، کە لەڕوی بنەما و بیروفکر،بەڵکو تەنانەت لە روی شەرع و بیروباوەریشەوە لەیەکتر جیاوازبوون.

لە بەناوبانگترین ئەو گروپ ودەستانەی کە بە بیلانیکی تۆخمە دامەزابوو ئەم مەزهەبەی دوازدە ئیمامی (الاثنا عشرية) بوو، کە ئێستا لە ئێران و عێراق و لوبنان دا هەیە، و بریتیەلەگەورەترین مەزهەبی شیعی سەردەمی ئێستامان. سەرکردەکانی ئەم کۆمەڵەیە دەستیانکرد بەزیادکردنی ئەو شتانە بۆسەر ئیسلام کە دەگونجێت لەگەڵ ئەو هەڵوێستەی کە ئێستا رووبەروویان دەبێتەوە، ودەستەبەری و مسۆگەری بەردەوام بوونی رێڕەوی رێبازەکەیان دەکات بە بیانوی دیارنەبەبوون و غیابی پێشەوایاندا. بێگومان بیدعەو داهێنراوێکی ترسناکیان لەناو ئاینی ئیسلامدا زیادکرد، و بانهێشتەی ئەوەیان دەکرد کەئەوشتانە بەشێکن لە ئیسلام و لێیشی جیانابێتەوە، لەئەنجامدا ئەم بیداعەوداهێنراوانە بوونە بەشێك لە بیروباوەڕو پێکهاتەی شیعەکان، لەوانە بیدعەی:

تایبەت بە پێشەوایەتی (الإمامە)، ویستیان کێشەی نەبوونی پێشەوای ئێستایا چارەسەربکەن و گوتیان: تەنها دوازدە ئیمام هەن!

وەگوتیشیان ڕێزبەندی ئەم ئیمامانەش بەم شێوەیەی خوارەوەیە:



١- عەلی کوڕی ئەبوتالیب
٢- حەسەنی کوڕی عەلی
٣- حوسەینی کوڕی عەلی
٤- عەلی زەینولعابیدینی کوڕی حوسەین
٥- موحەممەد باقری کوڕی زەینولعابیدین
٦- جەعفەری سادق کوڕی موحەممەد باقر
٧- موسای کازم
٨- عەلی رەزا
٩- موحەممەد جەواد
١٠- عەلی هادی
١١- حەسەنی کوڕی عەلی عەسکەری
١٢- موحەممەد کوڕی حەسەنی عەسکەری.

لێرەوە ئەم مەزهەبە ناسرا کە دوازدە ئیمامی یە، وە بۆئەوەی ڕاڤەی کۆتایی پێهێنانی ئیمامەکانیان لێرەدا بکەن، گووتیان: منالە بچوکە، موحەممەدی کوڕی حەسەنی عەسکەری نەمردووە، بەڵکو چۆتەناو یەکێك لە ژێرزەمینەکانی چیایەك لەچیاکانی، تاوەکو ئێستا هەر لەژیاندا ماوە (زیاتر لەهەزار ساڵە تاوەکو ئێستا)، و ڕۆژێك لە ڕۆژان دەشگەڕێتەوە تاوەکو فەرمانڕەوایەتی جیهان بکات، لەلای شیعەکان

بە مەهدی چاوەڕوانكراو (المهدی المنتظر) ناسراوە، وە بەقسەی خۆشیان گووتیان كە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەسیەتی پێكردوون بەناوی ئەم دوازدە ئیمامانە، بەڵام صەحابەكان (رەزای خوایان لەسەربێت) ئەم وەسیەتەیان شاردۆتەوە، بەهۆی ئەمەشەوەیە گشت صەحابەكان بەكافر دادەنێن، بەڵام هەندێكیان بەفاسقیان دادەنێن، كافریان ناكەن، ئەمەش لەبەر شاردنەوەی هەواڵی پێشەواكانیانە.

دوای ئەمەش سیستەمی میراتگرتنەوەی ڕەهای پێشەوایەتیان لە فارسییەوە زیادتكردو، گوتیان: دەبێت پێشەوا هەردەبێت كورە گەورە بێت، بە ئیمامی عەلی كوڕی ئەبوتالیب (رەزای خوای لەسەربێت) دەستپێدەكات و بەهەموو ئیمامەكانی دوای ئەودا شۆڕدەبێتەوە. ئەمەش - هەروەكو ئاشكرایە - هەرگیز لەئیسلامدا نییە، تەنانەت ئەو دەوڵەتە ئیسلامی یە سوننیانەی، وەكو خەلافەتی ئەمەوی و عەباسی و سەلجوقوی ئەییوبی وعوسمانیەكان، كە میراتگرتنەوەیان تێدا روویدا، نەیانگوتووە كە ئەو میراتگرتنەوەیە لە ئاییندایە، یاخود دەبێت لە بنەماڵەیەكی دیاریكراوبێت.

بە هەمان شێوە مەسەلەی بە پیرۆز سەیركردنی بنەماڵەی فەرمانڕەوایان لە سیستەمی فارسیەوە هێناو خستیانە سەر ئیسلامەوە،و گوایە ئەو ئیمامانەی ئاماژەیان پێكرا مەعصوم و بێهەڵەن، دواتریش دەڵێن قسەی ئەو ئیمامانە حوكم و بڕیاری قورئان و فەموودەكانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) وەردەگرن(واتە وەكو قورئان و فەرمووده وان). تەنانەت زۆربەی بنەما فیقهی و شەرعیەكانی ئێستایان لەسەر بنەمای ووتەی ئیمامەكان دامەزراوە، جا ئیمامەكان

خۆیان گوتبێتیان یان بەدرۆ بەزاری ئەوانەوە هەڵبەسترابێت، گەورەتریش لەوە، خومەینی، ڕێبەری شۆڕشی ئێرانی لە(لاپەرە ٥٢ ی ) پەرتوکی حکومەتی ئیسلامی(الحکومة الإسلامیة) خۆیدا دەڵێت: (( .. لە بنەماسەرەکییەکانی مەزهەبی ئێمە ئەوەیە کە ئیمامەکانمان پلەوپایەکی ئەوتۆیان هەیە نەهیچ فریشتەیەکی لە خوا نزیك، نەهیچ پێغەمبەرێك نایگاتێ ))!!

لێرەدا، ئەوپەری دوژمنایەتی و دژایەتیان هەیە بۆ گشت صەحابەکان (تەنها هەندێکیان نەبن، کە ژمارەیان لە سێزدە (١٣) کەس تێپەر ناکات)، ئەم دژایەتیکردنەشیان خودی هەندێك لە ئەندامانی ئالوبەیتیش دەگرێتەوە، لەوانە، ئیمام عەبباس (رضي الله عنە)، کەمامی پێغەمبەرە (صلی الله علیە وسلم)، هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (رضي الله عنهم)، کەبە حەبری ئوممەی ئیسلامی ناسراوە. شاراوەنییە کە هۆکاری تانەدان و بەکافر لەقەڵەمدانی ئەم دوو بەرێزانە (رضي الله عنهم) لەبەر ناکۆکی و ناتەبایی شیعەی دوازدە ئیمامیە لەگەڵ خەلافەتی عەبباسیەکان.

یەکێکیتر لەبیدعەی ئەو دوازدە ئیمامیانە ئەوە زۆربەی وڵاتە ئیسلامیەکان بە وڵاتی کوفر (دار الکفر) دادەنێن، لەکاتێکدا خەڵکی شاری مەدینە و مەککە و وڵاتی شام و میسریش بەکافر دادەنێن، سەبارەت بەمەش قسەگەلێك دەکەن و دەیاندەنەپاڵ پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیە وسلم)، ئەمەش لەلای ئەوان بە بەشێك لە ئاین دادەندرێت. ئەو ووتانەش لەسەرچاوە بنەرەتیەکانی خۆیانی، وەکو پەرتوکی الکافی و بحار الأنوار و تەفسیری القمی و تەفسیری



العیاشی و تەفسیری البرهان و چەندین سەرچاوەی تریایخۆندا ئاماژەیان پێکراوە.

بەرێچکە، هەموو ئەم شیعانەی هیچ یەك لە زاناکانی سوننە قەبوڵ ناکەن، هەموو پەرتوکە ڕاستەکانی فەرمدەکان و سوننەتیش رەتدەکەنەوە، نە بوخاری، نە موسلیم، نەتومزی و نە نەسائی، نە ئەبوحەنیفە، یان مالیك یان شافیعی یان ئیبن حەنبەل، بەهەمان شێوە نە خالیدی کوڕی وەلید، نە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاس، نە عومەری کوڕی عەبدولغەزیز، نە موسای کوڕی نەسیر، نە نورەددین مەحمود و نە سەلاحەددینی ئەییوبی، نە قیتز و نە بە موحەممەدی فاتیح یش و ...هتد، رازی نابن و ڕەتیاندەکەنەوە. لە دەرئەنجامی ئەم پشتگۆیخستن و رەکردنەوەی صەحابە و تابیعی

و پەرتوکەکانی حەدیس و تەفسیر پشتیان بەست بەو وتانەی کە دەیاندەنە پاڵ ئیمامەکانیان، ئەو وتانەش لەڕوی گێرانەوەو ریوایەتدا لەپەڕی لاوازیدان، هەربۆیە زۆر بیدعەی بەد و خراپ تیایاندا هەیە، لە رووی عەقیدە و پەرستش و کڕین و فرۆشتن بواریتردا پەیدا بوو. ئێمە لەم ووتارەدا مەبەستمان گێڕانەوەی سەرگوزشتە و بەسەرهاتی ئەم بیدعانەیان نییە، ئەم باس وخواسە پێویستی بەچەندین پەرتوك هەیە، بەڵکو تەنها ئاماژە بەسەروچاوەی کێشەکە دەکەین و بەس، تاوەکو رێچەڵەکەیان بگەین، ئەگینا باسەکەمان درێژە دەکێشێت ئەگەر بێتوو باسیان لێوەبکەین، لەوانە:

بیدعەی توقییە (التقية) و ریجعە (الرجعة) و بیدعەی قسەیان سەبارەت بە دەستکاری وگۆڕینی قورئان(تحريف القرآن) و بیدعەی خراپی بیروباوەڕیان بەرامبەر بە زاتی خوای (بەرز و بڵند)، و بیدعەی مەرقەدەکان ئەوکاروکردەوانەی لەسەر مەرقەدەکان ئەنجامیاندەدەن، و ئەو بیدعەخراپانەی لە رۆژی یادی شەهیدکردنی ئیمامی حوسەین (رەزای خوای لێبێت) دا دەیکەن، ئەمانەو هەزارەها بیدعەی تر کەبوونەتە کۆڵەگەوروکنی بنەڕەتی ناو ئاین لەلای شیعەی دوازدە ئیمامامیەکاندا.

هەموو ئەوەی تاوەکو ئێرە باسمان لێوەکرد، تەنها بەشێکی بەشێکە لە بیروهزری مەزهەبی شیعی دوازدە ئیمامی، هەروەها لەوماوەیەی مێژوودا، جگە لەم شیعە دوازدە ئیمامیانەش، چەندین کۆمەڵەی تر دەرکەوتن، بەتایبەت لە ماوەیەی کەبە سەرگەردانی شیعەکان ((حيرة الشيعة)) ناسراوە، کەلە ناوەڕاستی سەدەی سێیەمی کۆچیدا، لەدوای

وەفاتی حەسەنی عەسکەری (ئیمامی یازدەمیان) دەستیپێکرد. لەسەرەتایی ئەو کاتەدا، ئەو پەرتووك و بڵاوکراوانە دەرکەوتن کە ئەم عەقیدە و بیرۆکانە دەچەسپێنێت، و ئەم پەیڕەو ڕێبازانەش بەشێوەیەکی تۆکمە لە ناوچەی فارس بەتایبەت، و لە جیهانی ئیسلامی بە شێوەیەکی گشتی، بڵاودەبووەوە،

بەڵام بەبێ پێکهێنانی دەوڵەتێك کە ئەم بیروفیکرانە بەشێوەیەکی فەرمی بناسێنێت، بەڵام لە کۆتاییەکانی سەدەی سێیەم و سەرەتاکانی سەدەی چارەمی کۆچیدا، چەند گۆڕانکاریەکی ترسناك رویاندا کە بوونە مایەی گەیشتنی شیعەکان بە دەسەڵات لەهەندێك ناوچەدا، ئەمەش بوو بە مایەی نەهامەتیەکی گەورەو ترسناك بۆسەر ئوممەی ئیسلامی. دیسان قسەکە دووبارە دەکەینەوە کە بڕیار وحوکمدان لەسەر شتێك لقێکە لە وێناکردن و تەسەوڕکردنی ئەوشتە، جا بۆئەوەی بڕیارێك سەبارەت بە کارێك لە کارەکان یان کێشەیەك لەکێشەکان بدەین، هەر دەبێت یەکەم جار زانستمان هەبێت، ئینجا دوای بەدەستهێنانی زانیاری ڕاست ودروست ئەوسا دەتوانین بڵێین: ئەمە دەشێت، وە ئەوە ناشێت، یان گونجاوترە ئەوهاوئەوهابێت،

بەڵام قسەوبڕیاردان بەگوێرەی سۆزوعاتیفە و بێخوێندنەوەو دیراسەکردن ئەمە خاوەنەکەی بەرەوهەڵدێر دەبات.

# دەسەڵاتداری شیعەکان

گومانی تێدانییە زۆربەی خوێنەران لەوانەیە توشی سەرسورمان بووبێتن- هەروەکو لەفیدباکەکانیاندا بۆم دەرکەوت - کاتێك مێژووی سەرهەڵدانی شیعەکانیان زانی، گومانیشی تێدانییە کە ئێمە مێژوو نانوسینەو تەنها بەمەبەستی زانی ئەو رووداوانەی کە لە قۆناغە جیاجیاکانی مێژوودا روویانداوە، بەڵکو بۆئەوەیە تاوەکو پەندوئامۆژگاریان لێوەربگرین وبشتوانین بەشێوەیەکی باشترو چاکترو روونتر مامەڵە لەگەڵ قەیران و کێشەکانی ئێستاماندا بکەین.

لەبەرئەوە دەستبەرداربوون و وازهێنان لەم مێژووە بەتاوان دادەندرێت دەرهەق بە مافی نەوەی هاوچەرخ، هەروەها خۆشمان بێبەش و مەحروم دەکەین لە نور و ڕوناکی ئەگەر بێتوو پشت هەڵکەین لە دیراسە و توێژینەوەکردن لە ڕەگوریشەی مەسەلەکە، بێگومان هەروەکو -بەرلەمە- فەرمانیشمان پێکراوە کە دیراسەی چیرۆك و بەسەرهاتی پێشینەکان بکەین، بۆئەوەی پەندوئامۆژگارییەکانیان لەسەر واقیعی خۆماندا جێبەجێ بکەین، خوای گەورە دەفەرمۆێت:

﴿ فَاقْصُصِ الْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾ ﴾ .

واتە: ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چیرۆکی پێشینەکانیان بۆباسبکە بەشکەم بیردەکەنەوە.) (سورەتی الأعراف: ئایەتی ١٧٦) نابێت تەنها بەگێرانەوەیەکی روتی چیرۆکەکان ئیکتیفا بکەین و وازبهێنین، بەڵکو پێویستە بیریان لێبکەینەوە، پاشانیش سودی کردارەکیان لێوەربگرین و یارمەتیمان بدات لەتێگەیشتنی واقیعی دەوروبەرمان و داهاتوشمان رۆشنبکاتەوە.

لەسەرەتادا، حەزدەکەم ئەم وتارەم بە دوو سەرنجی گرنگ دەستپێبکەم:

## هەرچی یەکەمیانە:

ئەوەیە کە تاوەکو لەم وتارەم تێبگەیت و سودوقازانجی لێوەربگریت، ئەوا پێویستە وتارەکەی پێشترم کە بەناونیشانی ((ڕەچەڵەکی شیعەکان)) بخوێنێتەوە چونکە ڕەگوریشەی سەرهەڵدانی شیعەکان و هەندێك ئاماژەی سەبارەت بە بیروباوەری شیعەکان لە خۆدەگرێت، کەیارمەتی دەردەبن بۆ تێگەیشتن لەئاراستەی روداوەکان.

بەڵام هەرچی خالی دوەمشیە، ئەوە من تاوەکو ئێستا تەنها خەریکی گێرانەوەی روداوەکان بوومە و تەنها ریوایەتە راست ودروستەکانیشم بۆگێڕاوەتنەوە، هێشتا رانەوەستاوم تاوەکو هەوڵوێستی خۆمان سەبارەت بەشیعەکان رابگەێنین و سروشتی پەیوەندی نێوانمان لەگەڵیان دیاری بکەین..

بابگەرێینەوە سەر چیرۆکی شیعەکان..

بێگومان، دوای وەفاتکردنی حەسەنی عەسکەری (کەکردۆتیانە ئیمامی یازدەمی خۆیان)، شیعەکان چوونە ناو سەردەمێك لەمێژوودا بەسەردەمی سەرگەردانی شیعەکان ((فترة حيرة الشيعة)) ناسراوە، لەماوەیەدا شیعەکان بۆسەرچەند تاقم کۆمەڵەیەکی زۆردا پارچە پارچە بوون، هەریەك لەوتاقم و کۆمەڵانە بەهەوا و ئارەزوی خۆی ئایینی بۆخۆی دادەرێشتەوە، ئەمەش بەمەبەستی هێنانەدی مەرامێکی سیاسی باشتر بۆخی.. لە بەناوبانگترینی ئەم تاقم و کۆمەڵانە مەزهەبی دوازدە ئیمامی بوو، کەلە وتارەکەی پێشوو (رەچەڵەکی شیعەکان) دا باسمانکرد. ئەم مەزهەبەش تەنها مەزهەبی گۆڕەپانەکە نەبوو، بەڵکو شانبەشانی ئەمان تاقم و مەزهەبێکی تر سەریهەڵدا،کە کاریگەرییێکی زۆرخراپی لەسەر ئوممەی ئیسلامیدا هەبوو، ئەو مەزهەبەش بریتی بوو لە مەزهەبی ئیسماعیلیەکان.

مەزهەبی ئیسماعیلی لە مەزهەبە هەرە سەرلێشێواوەکان بوو، کە لە بنەرەتدا زۆربەی زانایانی ئیسلام لە بازنەی ئیسلامەتی دەریانکردۆتە دەرەوە و بەکافریان لەقەڵەم داوە، ئەم مەزهەبەش هەر لە سەرەتادا بە پیلانێکی ترسناکی یەکێك لەو جولەکانە دەستیپێکرد کە ویستوویانە لەدژی ئوممەی ئیسلامی پیلانبگێرن، ئەو کەسەش ناوی مەیمون ی قەدداح بوو، مەیمون خۆی بەموسڵمان نیشاندا و لە موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل ی کوڕی جەعفەری سادق نزیککردەوە و تەنانەت هاوەڕێیەتیشی کرد. موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلیش یەکێك بوو لە ئالوبەیت، و نەوەی جەعفەری سادق (کەئیمامی شەشەم لەلای دوازدە ئیمامیەکان)، و باوکیشی، کە ئیسماعیلە، برای موسای کازمی ئیمامی حەفتەمی دوازدە ئیمامیەکانە.

بێگومان، مەیمونی قەدداح بەکارێکی زۆر سەرسوڕهێنەری ئاوا هەڵسا، کە بەڵگەیە لەسەر ئەو ڕق وقینە بەتینەی کە دژ بە ئوممەی ئیسلامی هەیبوو، تائەو ڕادەیەی کە پیلانبگێڕێت بۆ لەناوبردنی ئیسلام، تەنانەت دوای مردنی خۆشی بەچەندان ساڵ! مەیمونی قەدداح کوڕێکی خۆی بەناوی کوڕی موحەممەد هوە ناونابوو (عەبدوڵلا)، وەسیەتیشیکرد کەناوی کوڕ نەوەکانیشی بەهەمان ناوی کوڕ و نەوەکانی موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل بکات، دواتر لە سەردەمێك لە سەردەمەکانی مێژوو بە ڕەچەڵەك جولەکانە بانگهێشەی لەئالوبەیت بوون دەکەن بە بیانووی ئەوەی ئەوان لە نەوەی موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری سادقن! بەوەندەش ناوەستن، تەنانەت بانگهێشەی ئەوەش دەکەن و دەڵێن پێویستە ئەو گەورەترین پێشەوایەتی (الإمامة الکبری) یەی کە قیادەی هەموو ئوممەی ئیسلام دەکات، دەبێت تەنهاهەر لە وەچەی ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری سادق بێت، نەك لە وەچەی موسای کازمی کوڕی جەعفەری سادق وەکو ئەوەی شیعەی دوازدە ئیمامی بانگهێشەی بۆ دەکات.

مەرامەکەی مەیمونی جولەکە مەرامەکەی هاتەدی، و مەزهەبی ئیسماعیلی دروست بوو، و نەوەکانی مەیمونی قەدداح دەستیانکرد بەدارشتنی بیروباوەڕی فیکرەی ئاوەها لەناو مەزهەبەکەیان کە بەتەواوەتی پێچەوانەی وردودرشتی ئاینی ئیسلامدا، لە قێزەونترینان ئەوەیە کە بڕوایان وایە دەڵێن کە خوا (کە زۆر لەوە بەرز و بڵندترە) تێکەڵاو ئاوێتەی ئەو ئیمامەیان دەبێت کەحوکمرانیەتیان دەکات، بۆیە ئیمامەکەیان بەخوا دەزانن. بەهەمان شێوە بڕوایایان بە

تەناسوخی رۆحەکان هەیە-واتە رۆحی مردوەکان، بەتایبەت هی ئیمامەکانیان،سەرلەنوێ دەگەڕێنەوە بۆ ژیان لەناو لاشە و جەستەی زیندوانی تردا - برواشیان وایە کە هەموو پێشەواکانیان لەپاش مردنیان بۆ ژیانی دونیا دەگەڕێنەوە. بەڕاستی ئەمانە لەوپەری بەربەرەڵلای و شێتیدان، بەئاشکرا بوختان بەصەحابەکان دەکەن، تەنانەت جوون بە زاتی کەسایەتی پێغەمبەر (سەڵات و سەلامی خوای گەورەی لەسەربێت) یش دەدەن، لەگەڵ ئەوەی دەڵێن گوایە لەوەچە و نەسەبی ئەویشن، لەگەورەترین هیوا و ئاواتەکانی ئەم تاقم و دەستەیە کوشتنی سەرکردە سونننییەکان بووە لە جیهانی ئیسلامیدا. لەدواتردا ئیسماعیلیەکان پلەوپایەکی گەورە بەدەست دەهێنن، پاش کەمێکیتر باسی لێوە دەکەین.

بانگەوازی ئیسماعیلیەکان بەفیکرو هزرە روخێنەرەکانیەوە چالاکبوو، و لەناو چینی نەفام ونەزانەکاندا بڵاوبووەوە، بۆئەمەش خۆشەویستی خەڵك بۆ ئالوبەیتیان بەمەبەستی مەرامی خۆیان بەکاردەهێنا، وایان لە چینێك کرد کە بڕوایان پێبهێنن کە ئەوان لە نەوەکانی پێغەمبەرن (صلی الله علیە وسلم)، زۆر لەو فارسانەی کە بەڕوالەت موسولمان بووبوون بەڵام لە ناخەوە ئاگرپەرست بوون، پابەند بوون بەم بانگەوازەی ئیسماعیلیەکانەوە، یەك وانە حوسەین ی ئەهوازی بوو، کە لەبەناوبانگترین بانگخوازو گەورە دامەزرێنەرانی مەزهەبی ئیسماعیلی بوو، کەلە ناوچەی بەسرە بانگەوازی دەکرد، لەوێدا، چاوی بە کەسایەتیەکی زۆر شەراگێزی لەناو مێژووی ئیسلامیدا کەوت، ئەویش حەمەدان ی کوڕی ئەشعەس بوو، کە زانایان لە سەبارەت بە ڕەچەڵەکی ڕای جیایان هەیە، دەڵێن کە فارسێکی ئاگرپەرست بووە،

دەشڵێن جوولەکەی بەحرەین بووە، حەمەدانی کوڕی ئەشعەس نازناوی "قەرمیت"ی لێنرا، و بە تێپەڕینی کات کۆمەڵەیەکی بەناوی خۆیەوە دانا کەبە "قەڕامیتیەکان" ناسرابوون، کە لقێك بوو لە مەزهەبی ئیسماعیلیەکان، ئەگەرچی لەوان ترسناکتربوون. قەڕامیتیەکان هاوبەشی ماڵ و ئافرەتیان پێدروست و حەلال بوو، (واتە دوو پیاو بەیەکەوە یەك ژن وماڵیان هەبێت)، هەموو کردارە چەپەڵەکانی وەك: کوشتن،و زینا و شەڕواڵپیسی، و دزیشیان حەلال کرد، و دەستیان بە تالان و ڕێگری کرد، بۆیە هەموو چەتەو ڕێگر و لەیاسادەرچوان چوونەپاڵیانەوە، بەمکردارانەشیان بوون بە یەکێ لە ترسناکترین دەستەوتاقمەکانی ناو مێژووی ئیسلامیدا.

هەموو ئەم گۆڕانکاریانە،و چەندهایتر کەلەبەر زۆریان کە ناکرێت لێرەدا باسیان لێوەبکەین لەبەردرێژ بوونەوەی ووتارەکە، لە نیوەی دووەمی سەدەی سێیەمی کۆچیدا ڕوویاندا، و بەهۆی ئەمەشەوە سێ کۆمەڵەی گەورە بەدیارکەتن، هەریەکەیان دەیگۆت ئێمە لەسەر حەقین، لەکاتێکدا لە رووی عەقیدە و بنەما و ئەحکامەکان و هەمووشتێك لەیەکتری جیاوازبوون. ئەم سێ تاقمانەش: شیعەی دوازدە ئیمامی، و شیعەی ئیسماعیلی، و شیعەی قەڕامیتییەکانن. ناکۆکێکی ململانێ لەنێوان ئەمانە و سوننەکان هەبوو، بەهەمان شێوەی ئەو ناکۆکیکی و ململانێیەی کە لەنێوان خۆیاندا هەبوو، لەبەر نەبوونی بڕوا و متمانە بەو ڕێبازەی کە لایەنەکەی تر لەسەری بوو. بێگومان، ئەم دەستە و تاقمانە لەسەر بنەمای بەدواکەوتنی هەواوئارەزو،و بیدعە و داهێنان لە ناو ئایندا دامەزراون.

تاوەکو ئەم قۆناغەی مێژوو، هەموو بزوتنەوەکان بریتی بوو لە نانەوەی دلەراوکێ و پەشێوی لەناو ئوممەی ئیسلامیدا، بەڵام بێئەوەی بەدەسەڵات بکەن و دەستیان بەسەر کاروبارەکاندا بگرن، بەڵام لەکۆتایی سەدەی سێیەم سەرەتایی سەدەی چارەمی کۆچیدا، رووداوەکان بەشێوەیەکی گەورە گۆرانکاریان بەسەردا هات، وبوونە مایەی نەهامەتیەکی ترسناك.

خێراترین دەستەوتاقم لەم سێیانە لە گەیشتن بە دەسەڵات بریتی بوو لە قەرامیتییەکان، چونکە لە هەمووان دڕ و توندڕەوتربوون، یەکێك لە باونگەوازکارەکانیان بە ناوی ڕوستەمی کوڕی حوسەین خۆی گەیاندە یەمەن، و دەوڵەتێکی بۆ قەرامیتییەکان لەوێدا دامەزراند، و دەستیکرد بە ناردنی نێردراو بۆ شوێنی جیاجیا، و بانگەوازی خەڵکی دەکرد بۆ سەر بیروباوەڕی قەڕامیتیەکان، تەنانەت نێردراوی خۆی نارده مەغریب یش! بەڵام ئەم دەولەتە هەندەی نەخایاند و لەناوچوو، بەڵام قەڕامیتیەکان گەشەسەندنێکی تریان بەخۆبینی لە دورگەی عەرەبی، بەتایبەت لە بەحرەین (بەحرەینیش نەك ئەم بەحرەینەی ئێستا، بەڵکو دەکەوتە ڕۆژهەڵاتی دورگەی عەرەبی)، ئالەم شۆێنەدا دەوڵەتێکی قەڕامیتیەکان دامەزراو هەڕەشەیان دەکردە سەر ئاسایشی موسولمانان، هەڵسان بەکوشتنی حاجیانی ماڵی خوا.

لەوانەیە چەپەڵترین تاوانیان بریتی بوو لە :هێرشکردنە سەر مزگەوتی پیرۆزی مەککە لە ڕۆژی تەرویە (ڕۆژی ئاودان) لەساڵی ٣١٧ کۆچی،کوشتنی هەموو حاجیەکانیان لەناو حەرەمی مزگەوتدا، و دزینی حەجەرول ئەسوەد لە ناو کەعبە، دوای ئەوەی وێرانیانکرد.

دواتریش حەجەرول ئەسوەدیان ناردە شاری هەجەر لە ڕۆژهەڵاتی دورگەی عەرەبی، کەپایەتەختی خۆیان بوو، ماوەی بیست و دوو ساڵی تەواو لەوێدا مایەوە، تا لەساڵی **٣٣٩** کۆچیدا گەڕێنرایەوە کەعبە!

بەڵام هەرچی ئیسماعیلیەکانە، خاکی مەغریبیان بۆ خۆیان بە گونجاو زانی، لەوێدا بیروڕاکانی ڕۆستەم کوڕی حوسەینی فەرمانڕەوای قەرامیتیەکانی یەمەنی تێدا بڵاوبوو بووەوە، ئەمەش لە ڕێگەی پیاوێك بە ناوی بەبو عەبدوڵلای شیعی یەوەبوو. زانیمان هەردوو



کۆمەڵەی ئیسماعیلی و قەرامیتییەکان بانگهێشەی پێشەوایەتی ئیسماعیلی کوڕی جوعفەری سادق دەکرد، بۆیە یەکێك لە نەواکانی مەیمونی قەدداح بەناوی عوبەیدوڵڵای کوڕی حوسەینی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی مەیمونی قەداح، هەلێکی سوك وسانای دۆزیەوە بۆ دامەزراندی دەوڵەتیك لە مەغریب. بۆیە روویکردە ئەوێ لەگەڵ هەندێك لە شوێنکەوتووەکانی دامەزراندی دەوڵەتی ئیسماعیلیەی ڕاگەیاند، و بە مەهدی نازناوی دەرکرد، بانگهێشەی ئەوەی دەکرد کە گوایە ئەو پێشەوای بانگەوازی ئیسماعیلیەکانە و یەکێکە لە نەوەکانی موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی کوڕی جەعفەری سادقە، و پێشەواکانی پێشی ئەو لە باووباپیرانی تاوەکو ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری سادق هەموویان شاراوە بزر بوون، ویستیشی دڵی خەڵکی بۆلای خۆی ڕابکێشێت، بۆیە دەوڵەتەکەی ناونا دەوڵەتی "فاتیمیەکان"، ئەمەش بە درۆ بەناوی گەورەمان فاتیمەی کچی پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) کرد، لەکاتیکدا خۆیی لەبنەرەتدا جولەکە بوو.

بانگەوازەکەی عوبەیدوڵڵا زۆر بەخێرای بڵاوبووەوە ئەمەش هۆی قۆزتنەوی نەزانی خەلك و سۆزو عاتیفەیان، بەردەوام بوو لە فروانبوون تاوەکو دەستیگرت بەسەر باکووری ئەفریقا، چەندین بیدعەو کاری بەد و چوون بەصەحابەو، قسەکردن سەبارەت بەتوانەوە و تەناسوخی رۆحەکان و هتد بڵاوکردەوە، دەسەڵاتەکەی لە فراوان بووندا گەیشتە ئەوەی روبکاتە میسرو داگیری بکات لە ساڵی ٣٥٩ ی کۆچیدا لەسەر دەستی یەکێك لە سەرکردەکانی، ئەویش جەوهەری قەسڵی




ئیسماعیلی یە لە سەردەمی موعیزلیدینی للّای عوبەیدی (ڕاستر وایە بگوترێت عوبەیدی، لەبەر عوبەدوللّای مەهدی، نەگوترێت فاتیمی)، موغیزلدینی للّای عوبەیدی چووە ناو میسر و شاری قاهیرەی دامەزراند، بەهەمان شێوە مزگەوتی ئەزهەریش، بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی مەزهەبی شیعەی ئیسماعیلی تێیدا، زاناکانی ئەهلی سوننەی کوشت و چووندان بە صەحابەی ئاشکراکرد، دواتریش پێشەوای ئیسماعیلیەکانی دوای ئەویش لەسەر ڕێبازی ئەودا ڕێبازی ئەودا ڕۆیشتن، شێتاتی و سەرلێشێوای هەندێکیان گەیشتە ئەو ڕادەیەی بانگهێشەی خوایەتیش بکەن، لەبەناوبانگترینیان ئەلحاکیم بیئەمریللا بوو. بۆ بڵاوکردنەوەی مەزهەبەکەیان خەریکی دروستکردنی مزگەوتی زۆر، لە داگیرکردنی میسر و شام و حیجاز بەردەوام بووم بۆ ماوەی دوو سەدە، تا لەساڵی ٥٦٧ کۆچیدا سەلاحەددینی

ئەییوبی خراپەکارییەکانی لابرد و میسری لە چەنگ داگیرکاری ئیسماعیلیەکان رزگار کرد.

بەڵام هەرچی تاقمی سێیەمە، کە دەکاتە مەزهەبی دوازدە ئیمامی -لەگەڵ بیدعە زۆرەکانیشی- درندەیی کەمتر بوو لە دوو مەزهەبەکەی تر، چونکە بڕوایان بە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) و زیندوبوونەوە هەیە، بەڵام ئاینیان تووشی بیدعەی زەبەلاح و تاوانی ئابروبەر کرد، بانگەوازکارەکانیان خۆیان گەیاندە هەندێك بنەماڵەی گەورە لە ناوچەکانی فارس و عێراق لە ئەنجامی ئەمەدا لەهەندێك ناوچەدا گەیشتنە فەرمانڕەوایەتی...



خۆیان گەیاندە بنەماڵەی بەنی سامان، کەلەرەچەڵەکی فارسن، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئەوان ببن بە شیعە، کە فەرمانڕەوایەتی بەشێکی زۆری فارس (ئیرانی ئێستا)یان دەکرد، دەوڵەتەکەشی لە ساڵی ٢٦١ ەوە تا٣٨٩ ی کۆچی درێژەی کێشا، بەڵام بەشیعەکردن تێیدا تا سەرەتاکانی سەدەی چوارەمی کۆچی بەدیار نەکەوت.



بەهەمان شێوە خۆیان گەیاندە بنەماڵەی بەنی حەمەدان، کە لەبنەچەکەدا عەرەبن و لەهۆزی بەنی تەغەلوبن، فەرمانڕەوایەتی شاری موسڵیان دەکرد لە عێراق لەساڵی ٣١٧ ەوە تا ساڵی ٣٦٩ کۆچی، دەسەڵاتیان فراوان بوو تا گەیشتنە شاری حەلەب لە ساڵی ٣٣٣ەوە تا ساڵی ٣٩٢ ی کۆچی لەوێشدا دەسەڵاتیان بەردەوام بوو.

بەڵام ترسناکترین بنەماڵە کە پێیگەیشتن بریتی بوو لە بنماڵەی بەنی بوەیهی بە ڕەچەڵەك فارس، کە دەوڵەتێکیان لە ناوچەی فارسدا دامەزراند، دواتر کار گەیشتە داگیرکردنی خەلافەتی عەبباسی لەساڵی ٣٣٤ی کۆچیدا، ئەمە لەگەڵ هێشتنەوەی خەلیفەی عەبباسییەکان لە پایەتەختی خۆیدا، ئەمەش لەترسی ئەگەری کودەتای سوننەکان لەدژیان، بەم شێوە زیاتر لە یەك سەدە خەلافەتی عەبباسییەکانیان داگیرکرد! (لە ساڵی ٣٣٤ تا ساڵی ٤٤٧ی کۆچی) تاوەکو سەلجوقیە سوننەکان بەدیارکەوتن و عێراقیان لەژێر چنگی شیعەکان رزگارکرد، لەماوەی ئەو هەموو ساڵانەدا ئەم شیعانە رق و قینی توندی خۆیان بەرامبەر بە زانا و خەلیفەی سوننەکان دەردەبڕی، و لەسەر دەرگای مزگەوتەکان جوونیاندان بە صەحابەکانیان دەنووسی و لە ووتارەکانیاندا بە ڕاشکاوی جوونیان بە ئیمامی ئەبو بەکر و عومەر (رضي الله عنهم) دەدا، ئەم ماوەیەش سەردەمێکی خەمناك بوو لە مێژووی ئیسلامیماندا.

ئابەم بەشێوەیە زانیمان کە سەدەی چارەمی کۆچی بە تەواوەتی سەدەیەکی شیعی بوو: شیعە بویهیەکان دەستیان گرت بوو بە سەر بەشێکی ئێران و تەواوی عێراق، هەروەها سامانیەکان دەستیانگرتبوو بەسەر ڕۆژهەڵاتی ئێران وچەند بەشێکی ئەفغانستان و ڕۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامی، وەحەمەدانیەکانیش دەستیانگرتبوو بەسەر بەشێکی موسڵ و حەلەب، لەکاتێکدا قەرامیتیەکانیش دەستیانگرتبوو بەسەر ڕۆژهەڵاتی دورگەی عەرەبی و هەندێ جاریش دەگەیشتنە حیجاز و تەنانەت دیمەشق و یەمەنیش، بەڵام هەرچی دەوڵەتی عوبەیدی (بەدرۆ

بە فاتیمیە ناسرا بوو) بووبووە دڕندە و هەموو ویلایەتە ئیسلامیەكانی ناو قارەی ئەفریقای داگیركرد، ئەمە سەڕاری فەڵەستین و سوریا و لوبنانیش.

لەكۆیایی سەدەی چارەمی كۆچیدا، دەوڵەتی قەرامیتەكان روخا، لەناوەڕاستی سەدەی چێنجەمی كۆچیدا (ساڵی ٤٤٧ ی كۆچی) دەوڵەتی بەنی بوەیهیش روخا، بەڵام ئیسماعیلیەكان بەردەوام بوون لە حوكمڕانی تاوەكو ناوەڕاستی سەدەی سەدەی شەشەم (ساڵی ٥٦٧ی كۆچی)، بەمەش جیهانی ئیسلامی بووەوە سونني لەڕووی فەرمانڕاوەیەتی یەوە لەهەموو ناوچەیەكیدا، ئەگەرچی بانگەوازی مەزهەبی شیعەی دوازدە ئیمامی هەر مایەوە لە ناچەكانی فارس و چەند بەشێك لە عێراق، بەڵام بیَ ئەوەی فەرمانڕەوایەتیان بە دەست بێت.

كەش و بارەكە بەم شێوەیە مایەوە، تا ساڵی ٩٠٧ ی كۆچی (سەرەتاكانی سەدەی دەیەمی كۆچی) لەكاتەی كە ئیسماعیلی سەفەوی هەڵسا بە دامەزراندنی دەوڵەتی صەفەوی شیعی دوازدە ئیمامی لە ئێران (ئەمەش لەبەر باپیرەگەورەكەیان كە ناوی صەفی یەددینی ئیردبیلی بوو، لەبنەرەت فارس، كە لەساڵی ٧٢٩ی كۆچیدا مردووە)، ئەم دەوڵەتە فراوان بوو و شاری تەبریزیشی كردە پایەتەختی فەرمانڕەوایەتیەكەی، كەوتە ململانێیەكی دڕاندانە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی سونني هاوسیَ ی خۆیدا، بەمەبەستی لێدانی عوسمانیەكان، صەفەویەكان لەگەڵ پرتوگالیەكان هاوپەیمانیان كرد، بەشێكی عێراق یان داگیركرد كە لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیەكان بوو، لەوێدا دەستان كرد بە بڵاوكردنەوی رێبازی شیعە، بەڵام سوڵتان سەلیمی یەكەم

ڕێگەی نەدان و لەشەرێکی یەکلاکەرەوەی بەناوباندا ڕوبەڕویانبووە لەساڵی ٩٢٠ی کۆچیدا کە لە مێژوودا بەجەنگی چاڵدێران ناسراوە، سەرکەوتنێکی گەورەی بەسەریاندا بەدەستهێنا لە عێراقی وەدەرنان.

ڕۆژ هات ڕۆژ ڕۆی، ململانێی نێوان صەفەوی و عوسمانیەکان بەردەوام بوو، لەزۆربەی کاتەکانیشدا خاکی عێراق گۆرەپانی ئەم ململانێیە بوو، ئەم ڕەوشە بۆماوەی دوو سەدە بەردەوام بوو، دەوڵەتی صەفەویەکان فەرمانڕەوایەتی ئێرانیان کرد لە ساڵی ٩٠٧ تاوەکو ١١٤٨ کۆچی، کاتێك روخا (ئەم روخانەی صەفەویەکان لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەمی زاینی بوو)، دوای ئەمە خاکی ئێران بەسە چەند ناوچەك دابەشکرا، کە عوسمانی و روسی و ئەفغانی و سەرکردەکانی سوپای عەباسی سێیەمی دواین سوڵتانی صەفەویەکان لەسەری دەجەنگان.

دەوڵەتی عوسمانی پێینایە قۆناغی کزی و لاوازی و بێدەسەڵاتی، و ئەوروپی و روسەکان چاویان تێبڕی بوو، لەو کاتەش دا دەسەڵاتی لەسەر ناوچەکانی رۆژئاوای ئێران کەم بوو بووەوە، و سەرکردە یەك لە دوای یەکەکانی ئەم ناوچانەی ئێرانیش خۆشویستی و وەلایان بۆسەرکردە رۆژئاواییەکان هەبوو، وەلایان جارێك بوو ئینگلیز (ئەوانەی لە هیند و پاکستانەوە نزیکبوون)، جارێك بۆ فەرەنسی یەکان، وجارێکی تر بۆ روس هەبوو.

لەساڵی ١١٩٣ کۆچیدا (کە دەکاتە ١٧٧٩ زاینی)، ئاغا موحەممەدی قاجاری گەیشتە فەرمانڕەوایەتی کردن لە ئێران، لە بنەڕەت فارس و شیعە مەزهەب بوو، ئەگەرچی ئارەزوی بۆلای

عەلمانییەکان دەکرد، بۆیە بانگهێشەی بۆ مەزهەبی شیعەی دوازدە ئیمامی نەدەکرد، تەنانەت حوکمیشی پێنەدەکرد، خۆی و منالەکانی یەك لە دوای یەك فەرمانڕەوایەتی ئێرانیان دەکرد، ناوەناوە دەسەلاتیان فراوان دەبوو، ناوەناوە لاواز دەبووە، فەرمانڕەواکان بە "شا" نازناویان دەرکردبوو، ئەوە بنەماڵەیە لە فەرمانڕەوایەتی کەوتن لە ساڵی ١٣٤٣ ی کۆچی (= ١٩٢٥ زاینی)دا کاتێك رەزا پەهلەوی لێانراپەری و خۆیشی وەکو شایی ئێران ناساند، ئەمەش بە یارمەتی ئینگلیزەوە بوو. بەلام لە ساڵی ١٩٤١ زاینیدا لەبەر ناکۆکی لەگەڵیان ئینگلیزەکان تۆڵەیان لێیکردەوە، و لایانداو موحەممەد رەزا پەهلەوی کوڕیان لە شوێنیدا دانا، کە بەردەوام بوو لە فەرمانڕەوایەتی ئێران بە دەستوری عەلمانی تاوەکو ساڵی (١٣٩٩کۆچی= ١٩٧٩ زاینی)، کاتێك شۆرشی خومەینی شیعە مەزهەبی دوازدە ئیمامی رویدا، ئابەم شێوەیە فەرمانڕەوایەتی شیعەکان سەرلەنوێ گەڕایەوە ناوچەی فارس (ئێران). ئا ئەمەش سەرگوزشتەی حومکرانییەتی شیعەکان بوو لە جیهانی ئیسلامیدا هەر لەسەرەتایی دەرکەوتنی مەزهەبە شیعییەکانەوە تاوەکو سەردەمی ئێستامان، لە ڕاستیدا بەرونی بۆمان دەرکەوت کە بزوتنەوەی شیعەکان هەموویان بە شێوەی کودەتا و بەکژاداچوونەوە لەگەڵ حوکمڕانی سوننی بوون، لەمەشدا شێوەیەکی دینداری بە خۆشەویستی و خۆدانەپاڵ ئالوبەیتان بۆمەرامی خۆیان بەکاردەهێنا، هەروەها بینشمان کە لە هەموو قۆناغەکاندا هیچ ناکۆکییەك لە نێوان ئەم مەزهەبانەی شیعەکان و دوژمنانی ئیسلام لەوانە خاچپەرست یان روس یان ئینگلیز یان فەرەنسی یان پرتوگالیەکاندا روینەداوە، بەهەمان شێوە هیچ کێشە

و ململانێیەکیان لەگەڵ تەتارەکان یان جگە لەمانیشدا نەبووە، بەڵکو زانیمان کە چەندین جار یارمەتی و هاریکاریان کردوون. لەگەڵ ئەمشدا، ئێمە هاوسەردەمەکانی خۆمان لە شیعەکان تاوانبار ناکەین بەهۆی تاوانی باوباپیران و پێشینەکانیانەوە، بەڵکو بیروباوەڕ و فیکر و ڕێبازیان تاوتوێ دەکەین، کە سەددەرسەد کۆکە لەگەڵ بیروباوەڕ و فیکر و ڕێبازی باوباپیران، ئائەمەش بریتییە لە کرۆکی بابەتەکە، و بنچینەی کێشەکانە، باشە مادام هەموو شیعەکان پێیان واجبە کە ئیمامەتی (پێشەوایەتی) لە وەچەو بنەماڵەیەکی دیاری کراو بێت، مادام بیروباوەڕیان وابێت کە ئیمام و پێشەوا مەعسوم و بێگوناح و لە گوناحکردندا پارێزراون، مادام ئەوان سنوربەزێنی و بێڕێزی دەکەن بەرامبەر بە ئیمامی ئەبوبەکر و ئیمامی عومەر و ئیمامی عوسمان و هەموو سەباحەبەکانی ترو دایکانی ئیمانداران (خێزانەکانی پێغەمبەر-سەڵات و سەلامی خوای لێبێت- ڕەزای خوا لە گشت ئەسحابیش بێت). مادام هەموو ئەمانە روبدات، بەراستی نابێت وا دابنێین کە ئەوان نیەت و مەبەستیان باشە و پاکە، بەڵکو دەڵێین: بەراستی رۆڵەکان لەسەر هەمان شوێن پێی باوانیان رێیانکردووە(ماڵ بە ماڵخۆر نەچێت حەرامە).

# ترسناکی شیعـەکان

لەمەودوادەزانرێت:

هەڵوێستمان سەبارەت بە شیعەکان چی دەبێت؟

چۆن رەفتاریان لەگەڵدا بکەین؟

ئایە بێدەنگی باشترە لە قسەکردن؟

ئایە نەزانین باشترە لە زانین؟

زۆربەی موسولمانان پێانوایە دیاریکردنی هەڵوێستێکی دیاریکراو سەبارەت بە شیعەکان کارێکی ئەستەمە و شتێکی سەرلێتێکدەرە، هۆکاری ئەم ئەستەمیەش بۆ چەند شتگەلێکی زۆر دەگەرێتەوە..

لەم هۆکارانە، بۆ نمونە، نەبوونی زانیارییە، شیعەکان لەلای زۆرێك لە موسولمانان بریتین لە قەوارەیەکی شاراوە و داخراو، نازانن ئەو کیانە چییە، و چۆنیش سەری هەڵداوە، و نە سەیری رابردوەکەی و نە پێشبینی داهاتوەکەشی دەکەن، دواتریش ژمارەیەکی زۆر گەورە لە موسولمانان پێیان وایە شیعەکان تەنها بریتین لە یەکێك لە مەزهەبەکانی ئیسلامی وەکو مەزهەبی شافیعی و مالیکی و مەزهەبەکانی تر، ناشزانن کە جیاوازی سوننییەکان لەگەڵ شیعەکان تەنها لە شتە لاوەکی و لق و پۆپکەکان نیە، بەڵکو لە زۆربەی بنەماکانیشەوەیە.

یەکێکیتر لە هۆکارەکان بریتییە لەوەی کە زۆربەی موسولمانان نا واقیعی و ناکردارەکین، خەونی گەشبینانە وخەیاڵ پڵاوی دەبینن، بەبێئەوەی تاوتوێی مەسەلەکان بکەن، دەیان بینین، وەك چۆن بڵێت بەزمانی ئەقل و ژیری بدوێن، دەڵێن: بەگژیەکتری داچوونەوە بۆچی؟ دەیبا دانیشین و ناکۆکییەکانمان لەبەربەرینەوە، با سوننەکان دەست بخەینە ناو دەستی شیعەکان لەسەر یەك ڕێڕەو، مادام هەموومان بڕوامان بە خواو پێغەمبەرەکەی خوا (سەڵات و سەلامی خوای لێبێت) و ڕۆژیی دوای هەیە، لەبیریانکردووە لە کارەکە زۆر زۆر لەمە ئاڵۆزترە، بۆنموونە، ئەو کەسەی کە بڕوای بە خوا و پێغەمبەرەکەی و ڕۆژی دوایی هەیە بەڵام ئارەق و زینا بە حەلال دەزانێت ئەوا بەکافر لەقەڵەم دەدرێت، حەلالکردنی شتێك واتە بەحەلال زانینی ئەو شتە، و نکۆڵی دەکات لەوەی کە لە قورئان و سوننەدا بە حەرام داندرابێت، ئەگەر بێتوو ئەم گۆشە نیگایە لە روانگەیەکەوە زۆر شتی ترسناك لە چیرۆکی شیعەکاندا دەبینین کە پێویست دەکات لەلایەن زانایانی شەریعەت هەڵوەستەی لەسەربکرێت، بەمەبەستی دیاریکردنی حوکمی شەرعی سەبارەت بەو بیدعە ئاینییە زۆر و زەبەندانەی شیعەکان.

هۆکارێکی تر لەو هۆکارانەی کەوائەکەن هەڵوێست وەرگرتن ئەستەمبێت، زۆری ناسۆر و برینەکانی ئیسلامن لە زۆر لە وڵاتانی موسولمانانداو زۆری دوژمنان لە جوولەکە و خاچپەرست و شوعی و هیندۆسەکان و هتد، هەندێك لە بەناو بیرمەندەکان پێیانوایە کە بەرەیەکی تازە لە ململانێ نەکەینەوە. ئەمە ڕاست بوو لەسەرێکەوە ئەگەر بهاتبایە ئەو بەرەیە خۆیی داخراوبووایە و ئێمەش بماویستبایە



بیکەینەوە، بەڵام ئەگەر بێتوو خۆیی بەکردارەکی کراوە بێت بەرووی شەڕو پیلان و ئێش و ئازارەکان بەردەوام بەیانیان و ئێواران بۆمان بێت، لێرەدا بێدەنگ بوون کەمایەتییە، هیچ پێویست نییە ئەوپرسیارە دووبارەیەی سەر زاری زۆرێك لەخەڵکی بکرێت کە دەڵێت: ئایە شیعەکان ترسناکترن یا جووەکان؟ مەبەستیش لەو پرسیارە زاربەستنی بە خەبەرهێنەران و هۆشیارانی ئومەتی ئیسلامییە، هەروەها بێزارکردنی ئەوکەسانەیە کە کاردەکەن بۆ پاراستن و پاراستنی ئەم ئوممەتە. من بەرپەرچی ئەمانە دەدەمەوەو پێیاندەڵێم: چ رێگرێك هەیە موسولمانان لەیەك کاتدا بەرپەرچی دوو مەترسی بدەنەوە؟ و ئایە موسولمانە سوننەکانن ئەوانەی هەوڵدەدەن بیانووی هێرش بردنە سەر شیعەکان بدۆزنەوە، یان لە راستیدا بەزیاتر لە بەڵگەیەك کە تانەو تەشەنەکان لەلای ئەوانەوە دێت؟

لەودوو بەشی پێشووتردا، ووتاری رەچەڵەکی شیعەکان و ووتاری حوکمڕانی شیعەکان، مێژووی شیعەکانمان گێڕایەوە، بەروون و ئاشکرا ستەم و تەعەدای شیعەکانمان بینی کە دەرحەق بە ئوممەی ئیسلامی ئەنجامیاندا، من واش نازانم کە باردۆخی ئێستاشمان زۆر جیاوازبێت لەگەڵ رابردوومان، بەڵکو من وایدەبینم کە مێژوو خۆی خۆی دووبارە دەکاتەوە، هەروەها کورەکانیش رق و قینیان لە باوباپیرانیان بە میرات بۆماوەتەوە، جگە لە هیچ چاکە و خێرێك لە چینێك چاوەڕێ ناکرێت

کە پێیوابێت کە کەمێك نەبێت ئەگینا چینی صەحابەکان هەموویان گەندەڵ بوون، ئا ئەمەش بە درۆ خستنەوەیەکی راشکاوانەی ووتەی پێغەمبەرمانە (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەموێت: ((خيرُ النــاسِ قَرنـــي)) واتە: "باشترینی چینی خەڵکان ئەوخەڵکانەن کەوان لەسەردەمی مندا- ئەسحابی منن-". ئەم فەرموودەیەش لە بوخاری و موسلیم و صیحاح و سونەنەکان و موسنەدەکانیشدا هاتووە.

لەڕاستیدا واقیعی شیعەکان لە سەردەمی ئێستاماندا-نەك تەنها لە رابردوودا- ترسناکە ترسناکە..

با بێین تاوتوێی چەند بابەتەکی گرنگ بکەین کە تێروانمان سەبارەت بە مەسەلەکان رونتر دەکات، دواتریش یارمەتیمان دەدات لە تێگەیشتنی باشترین هەڵوێست کە دەبێت سەبارەت بەشیعەکان بیگرینەبەر، هەروەها لێرەدا دەزانین ئاخۆ دەبێت قسەبکەین یان بێدەنگی باشترە!

**یەکەم:**

هەموو لایەك هەڵوێستی شیعەکان دەزانێت بەرامبەر بە صەحابەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەر لەئەبوبەکری سیدیق و عومەری فارۆق و زونورەین عوسمانی کوڕی کوڕی عەففان (رضي الله عنهم)ەوە بگرە تەنانەت بە دایکی ئیماندارانیشەوە، لەسەروی هەموویانەوە، دایکی بڕواداران عائیشە (رضي الله عنهم)، تاوەکو گشت چینە گشتییەکانی ئەم جیلە گەورەیە، پەرتوك و سەرچاوەکانیان، تەنانەت بیروباوەڕو بنەما ئاینیەکانیان، بانگهێشەی فاسق بوون یان لە دین هەڵگەڕانەوەی ئەم چینە دەکەن، و بڕیاری سەرلێشواوی و

گومرابوونی زۆربەی صەحابەکان دەسەپێنن، بەشاردنەوەو دەستکاری کردنی ئایین تۆمەتباریان دەکەن.

لێرەدا ئایە دەبێت ئەو شتانە ببینین و خۆشمان بێدەنگ بکەین نەبادا فیتنە و ئاژاوە رووبدات، هەروەکو دەڵێن؟!

چ ئاژاوە و فیتنەیەك گەورەترە لە تۆمەتبارکردنی ئەم چینە پـاك و بێ وێنەیە بە گەندەڵی و درۆ؟!

بائەو کەسانە بێن لەگەڵ مندا بە ووتە پڕمانا و بە نرخەکەی هاوەڵەی بەرز و بەرێز جابری کوڕی عەبدوڵلا (رەزاو رەحمەتی خوای لێبێت) دابچینەوە کە دەفەرموێت: (( کاتێك پاشینەکانی ئەم ئوممەتە نەفرەتی لە پێشینەکانی کرد، ئەو کات هەرکەسێك زانستێکی پێبوو با ئاشکرای بکات و ڕایبگەیێنێت، شاردنەوەی ئەو زانستە وەکو شاردنەوەی ئەو شتە وایە کە بۆ سەر موحەممەد(سەڵات و سەلامی خوای لەسەربێت) دابەزیوە (قورئان) وایە.))[1]

ئایە لە ئاستی پرواتایی و قوڵی ووتەکە تێگەیشتن؟!

لەڕاستیدا تانەو تەشەندان لەو جیلی صەحابەکان تەنها بریتی نییە لە تانەو تەشەردان لە گەلێك کە گەرابێتنەوە بۆلای ئەو کارانەی کە لە پێشخۆیانەوە ناردوویانە، وە ئەوەش نییە کە هەندێك دەڵێن: تانە و تەشەردان لە صەحابەکان هیچ زیانێك بە صەحابەکان ناگەیێنێت، چونکە صەحابەکان وان لە بەهەشتا، بەکوێرایی چاوی شیعە و هاو

---

(١) بە مەرفوعی گێردراوەتەوە، زەعیفە، وە ریوایەتەکەش لە ووتەی صەحابی جابری کوڕی عەبدوڵلایە

وێنەکانیان. بەڵام کارە زۆر ترسناکەکە لەو راستیە دایە کە تانەوتەشەندان لە صەحابەکان بریتییە لە تانەوتەشەندانێکی راستەوخۆ لە ئایین، ئێمە ئایینمان لە رێگەی هیچ کەسێکەوە جگە لەم صەحابانەوە(رضي الله عنهم) وەرنەگرتووە، باشە ئەگەر بێتوو کۆمەڵێك شەك و گوومان لەسەر خو و رەوشت و نیەت و کاروکرداری ئەو صەحابانە دابنێن، باشە ئەو کات دوای چ ئایینێك بکەوین؟! بەڕاستی ئاینمان لەدەست چووە، ئەگەر هاتوو بەمە قایل بین، ئەوا فەرموودە و فەرمانەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) یشمان لە دەست چووە، بەڵکو ئێمە بە شیعەکان دەڵێین: کورە ئەوە چ قورئانێکە ئێوە دەیخوێننەوە؟! ئەدی ئەو کەسانەی کە قورئانیان بۆمان گواستۆتەوە هەر گرۆی ئەو صەحابانە نین کە ئێوە تانەوەتەشەنیان لێدەدەن؟! ئەدی ئەو کەسەی هەڵسا بە کۆکردنەوەی قورئان بریتی نەبوو لەو ئەبوبەکری سدیق (رەزاو رەحمەتی خوای لێبێت) کە ئێوەی بانگهێشەی ئەوە دەکەن کە فێرو حیلەی لەسەر خەلافەت کردووە، باشە ئەدی بۆ قورئانییشی نەگۆڕی بەو شێوەی کە گوایە سوننەتی گۆڕیووە؟!

لەراستیدا پێغەمبەرمان(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت:

((عَلَيكُم بِسُنَّتِي وَ سُنَّةِ الخُلَفاءِ الراشيدِينَ المَهديِّينَ مِن بَعدي.))[1]

واتە: دەستبگرن بە رێباز و سوننەتی من و رێباز و سوننەتی جێنیشین و خەلیفە رێنمونیکراوەکانی دوای من. رێبازو سوننەتی چوار خەلیفەکان بریتین لە بەشێك لە بەشەکانی ئیسلام و لێشی

---

(١) ئیمامی ترمزی و ئیبن ماجە و ئەحمەد ریوەتیان کردووە.

جیانابنەوە، هەرچ کارو کردارێك ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی پێیهەڵسابن چ لە حوکم و چ لە هەڵوێست بە بەڵگەو حوججە دادەندرێت لە سەر موسولمانان لە هەموو کات و شوێنێکدا، تاوەکو رۆژی قیامەت، ئیتر باشە چۆن قەبوول بکەین تانە تەشەن لەمانە بدرێت؟!

بۆیە دەبینین زانا بەرێزەکانمان کاتێك پیاوێکیان ببینیایە بەقسە بێرێزی بەرامبەر بە صەحابەکان بکردایە ئەوا لێیڕادەپەرین، ئەوەتا ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (رەحمەتی خوای لێبێت) دەیفەرموو: (( هەرکاتێك پیاوێکت بینی بە خراپە باسی ئەصحابی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) دەکرد، ئەو تۆمەتباری بکە بەوەی لە ئیسلام دەرچووە))[1]. ئەلقازی ئەبو یەعلا دەفەرمووێت:

((ئەو ڕایەی کە شەرعزانەکان لەسەری کۆکن سەبارەت بە چووندان بە صەحابەکان ئەوەیە کە ئەگەر کابرا ئەم کردارە بە حەلالبزانێت ئەوا کافردەبێت، بەڵام ئەگەر بە حەلالینەزانێت ئەوا فاسق دەبێت))[2].

هەروەها ئەبو زەرعەی ڕازی دەفەمووێت:

(( ئەگەر بینیت کەسێك لە پلە و پایەی ئەصحابی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)کەمدەکاتەوە، بزانە ئەو کەسە زندیقە))[3].

---

(١) ئیبن تەیمیە: الصارم المسلول علی شاتم الرسول، بەرگی ٣ لاپەرە ١٠٥٨.
(٢) ئیبن تەیمیە: الصارم المسلول علی شاتم الرسول، بەرگی ٣ لاثترة ١٠٦١
(٣) خەتیبی بەغدادي: الكفاية في علم الرواية، لاپەڕە ٤٩.

بەڵام هەرچی ئیبن تەیمیەیە دەفەرمووێت:

(( هەرکەسێك بانگهێشەی ئەوەبکات کە گوایە ئەصحابەکان پاشگەزبوونەتەوە لەپاش پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، تەنها هەندێکیان نەبێت کە لە دە کەس و هەندێك تێپەرناکەن، یا عامەی صەحابان بە فاسق دابنێت، هیچ گومانی تێدانییە ئەو کەسە کافر بووە.))[1]

لەڕاستیدا ئەو توونده نواندنە لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لە پلەوپایەی صەحابان بەکەم سەیر دەکەن هەموو لەبەر ئەوەیە چونکە صەحابەکان ئەوانەن کە ئایینی ئیسلامیان بۆمان گواستۆتەوە، هەرکاتێك کەسێك لە پلەوپایەی ئەوان کەم بکاتەوە ئەوا ئەو کەسە شەك و گومان ئەخاتە ناو خودی ئایینی ئیسلامەوە، هەروەها لەبەرئەوەی چونکە ستایش و مەدح و سەنای ئەم جیلە گەورەیە لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزو لەزۆر بابەتی بێشوماری فەرموودەکانی پێغەمبەری ئەمین (صلى الله عليه وسلم)یشدا هاتووە، ئەمانە هەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە تانەو تەشەندان لە ئەصحابان واتە بەدرۆخستنەوەی خوا و پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم).

لەوانە هەبێت بڵێت: ئێمە هەرگیز نەمانبیستووە کە فولان و عەللان لە شیعەکان کەسایەتی صەحابان لەکەداربکەن، من سەرەنجی ئەمانە بۆ سێ خاڵ رادەکێشم:

**یەکەمیان:** بریتییە لەوەی کەمەزهەبی شیعەی دوازدە ئیمامی لەبنەرەتدا واتە صەحابەکان پیلانیان گێڕاوە لە دژی ئیمامی عەلی

---

(١) ئیبن تەیمیە: الصارم المسلول على شاتم الرسول، بەرگی ٣ لاپەرە ١١١٠

کوڕی ئەبی تاڵیب (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت) و ئالوبەیت و ئەو ئیمامانەی شیعەکان باوەڕیان پێیان هەیە، پاشانیش هەروابێتەوە هەرچی شیعەی دوازده ئیمامی ئێران و عێراق و لوبنان هەیە بیروبڕوای وایە کە صەحابەکان گەندەڵ بوونە واتە لەرێ لایان داوە، ئەگەر باوەڕیان بەوە هەبووایە کە صەحابەکان پیاوی چاك و پاك بوونە ئەوا ئەوکاتە بنەماکانی مەزهەبی شیعەکان لەبنەرەتدا دەروخا و بەناویەکتردا دەکەوت، جا بۆ ئەوەی لەمە سەلامەت بن هەموو شیعەکان بە سەرکردە و ژێردەستەکانیانەوە هیچ ڕێز و شکۆمەندێك بۆ صەحابان دانانێن، و بە هیچ شێوەیەك لە شێوەکان ئایین لە صەحابان وەرناگرن.

هەرچی خاڵی دووەمە بریتییە لەوەی کە سەرکردە شیعەکان هەرکاتێك بگەنە ئەوەی کە دژایەتیان بەرامبەر بە صەحابان دیاربخەن ئەو کات رادەکەن، ئەگەر چی لەهەندێك قسە و هەڵوێستیاندا ئەم دژایەتیەیان بە دیار بکەوێت، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ وَلَوْ نَشَآءُ لَأَرَيْنَٰكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَٰهُمْ ۚ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِى لَحْنِ ٱلْقَوْلِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٠﴾ ﴾ سورەتی محمد: ٣٠.

هەموو لایەکەمان ئەو مێزگردەمان بینی نێوان دکتۆر یوسف قەرزاوی - خوابیپارێزێت - و رەفسەنجانی لە کەناڵی جەزیرەدا پێشکەشکرا، بینیمان چۆن رەفسەنجانی رایدەکرد لەهەموو ئەو هەوڵانەی کە دکتۆر قەرەزاوی دەیدا تاوەکو


مێزگردێک لە نێوان ڕەفسنجاوی و قەرزاوی

وا لە رەفسەنجانی بکات بە باشە باسی صەحابە و دایکانی ئیماندار بکات. هەروەها لەو کاتەی پرسیار لە خامەنەئی - رابەری شۆرشی ئیسلامی ئێستا - سەبارەت بە حوکمی جوون دان بە صەحابان کرا، نەیگوت: ئەمە شتێکی هەڵەیە یاخود شتێکی حەڕامە، بەڵکو بە وەڵامێکی ساردو سڕ وەڵامیداوە و گووتی: هەرچ قسەیەك ببێتە هۆی دروست بوونی لێکترازانی موسولمانان ئەوە بەهەموو شێوەیەك حەڕامە لە رووی شەرعەوە. حەڕامی جووندان بە صەحابان لەلای خامەنەئی لەبەر ئەوەیە چونکە دەبێتە هۆی لێکترازاندنی ریزی موسولمانانە، نەك لەبەر ئەوە بێت چونکە خۆی لەخۆیدا حەڕامبێت، ئائەمەش لە ڕۆژنامەی ئەهرامی میسری لە بەرواری ٢٢ ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٦زایینی دا بڵاوکرایەوە.

هەرچ خاڵی سێیەمەیشە بریتییە لەوەی ئاگاداری بیروباوەڕی تەقییە (التَّقية) یان ببین، کە لە دەیا نۆیی(٩/١٠) ئایین پێکدێنێت هەروەکو خۆیان دەیڵێن، واتە ئەوان لەوە راهاتوون کە شتگەلێك بڵێن کە پێچەوانەی بیروباوەریشیان بێت کاتێك کە دەسەڵاتدار نەبوو، یان بۆیان نەچووە سەر، بەڵام لەو کاتەی کە دەستیان بڕوات و هێزو توانایان هەبێت ئەوا شتەکە بەڕاشکاوی و ئاشکرایی، لەمێژووشدا شتی وا روویداوە، بینیمان لەکاتی فەرمانڕەوایەتی کردنی ناوچە سوننی یەکانی وەك عیراق و میسر و مەغریب و هتد، بۆ نموونە، لەسەردەمی خەلافەتی عەبباسیەکاندا، شیعەکان دەستبەجێ بەئاشکرای جوونیان بە صەحابان دەدا، ئا ئەم جووندانەشیان کردبووە بنەمایەك لە بنەماکانی ئایین لەلای ئەوان.

کەواتە لە ڕێگەی ئەم مەسەلەوە، ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کەپێویستە قسەبکەین سەبارەت بە ڕاستییەتی باس و خواسی ئەصحابە بەرێزەکان، ئەگینا ئەو کەسەی لە ئاستی ئەم راستییەدا بریتییە لە شەیتانێکی لاڵ، و سەرئەنجامی بێدەگبوونەکەشی بریتییە لە لەدەستدانی ئایینی خۆی.

**دووەم:** مەترسی بەشیعەکردن (التشیع) لە جیهانی ئیسلامیدا.

بێگومان بەشیعەکردن لە زۆر لە دەوڵەتە ئیسلامییەکاندا بەهەنگاوی زۆرخێرادا دەڕوات، بەڵام لە هیچ شوێنێکدا بە ئەندازەی ئێران و عیراق و لوبنان بڵاونابێتە، تەنانەت ئێستاش زۆر بەتوندی لە بەحرەین و ئیمارات و سوریا و ئوردن و سعودیە، میسر و ئەفغانستان و پاکستان و جگە لەمانەش بڵاودەبێتەوە، وە ترسناکتر لەمە ئەوەیە زۆرکەس هەڵگری ئەفکار و بنەمای شیعەن بەبێ ئەوەی خۆیشی دەرك بەوە بکات کەبۆتە شیعە.



لەپاش ئەوەی ئەم وتارانەمان بڵاوکردەوە، ژمارەکی زۆر نامەمان بۆهات کە نێرەری ئەم نامانە بەوتەی خۆیان دەیانگووت سوننەین بەڵام زۆر لە ئەفکارو تەصەوراتی مەزهەبی شیعەکان مێشکیانی داگیرکردووە، شاراوەنییە لێمان کە هێرشی و شاڵاوی کوێرانە دەکرێتە سەر ئەصحابان لە لاپەرەی ڕۆژنامەکان و کەناڵە ئاسمانیەکان لە ناو وڵاتە سوننییەکاندا، لەدواین شاڵاویشدا کە بەم رۆژانەی دوای لە یەکێك لە ڕۆانامە میسریەکان کرایە سەر دایکمان و گەورەمان عائیشەی کچی ئەبوبەکری صیدیق (رضي الله عنهم)، و ئەو شاڵاوەی رۆژنامەیەکی تر کردیە سەر ئیمامی بوخاری (رەحمەتی خوای لەسەربێت)، هەروەها ئەو بەرنامە کەناڵە ئاسمانیانەی کە لەلایەن هەندی لە میدیاکارە بەناوبنگەکانەوە پەخش دەکرێت، کە تێیدا تانەوتەشەن لەصەحابان و برینداركردنیان بە قسە، لەهەموو ئەلقەیەکدا.

یەکێکیتر لەو هۆکارانەی کەئەبنە هۆی ئەستەمی خۆ بێدەنگکردن، ئیزدیواجیەت و لە یەکچوون هەردوو رێبازی شیعە و رێبازی صۆفی یەکانە، بە بانگهێشەی پشکداری هەردوولا لە خۆشەویستییان بۆ ئالوبەیت. هەروەکو دەزانین، موزهەبە صۆفیەکان لە ژمارەیەکی زۆری وولاتانی جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبوونەتەوە، ئەم صۆفیانەش تووشی زۆرێك لە بیدعە و کاری نەخوازاو بوونەتنەوە، لە هەندێك هەڵسووکەوت و بابەتدا لەگەڵ دا شیعەکاندا یەکگدەگرنەوە لەوانە بە پیرۆز سەیرکردنی قەبری ئال و بەیت، دواتریش ئەگەری بڵاوبوونەوی شیعەگەری لەژێر سایەی بەربڵاوی صۆفیەکاندا لە وڵاتانی موسولماندا هەیە.

سێیەمیان:

باردۆخی عێراق زۆر ترسناك، هەروەها کوشتنی موسولمانە سوننەکان تەنها لەبەر ناسنامەیان بۆتە کارێکی دووبارە و باو، ئەمنداری گشتی بەرەی زانایانی موسولمانانی سوننە لە عێراق، حارس زاری باس دەکات کە زیاتر لە سەد هەزار سوننی تەنها لەماوەی نێوان سالآنی ۲۰۰۳ تاوەکو ۲۰۰٦ زاینیدا گوژراون، سەرەڕای ڕاگوێزانی بەردەوامیش لە چەندین شوێندا بە مەبەستی دەستگرتنی بەسەر ئەم شوێنانەدا لەلایەن شیعەکان، لەسەروی هەموو ئەمەشەوە، زۆرینەی راگوێزاوەکانی دەرەوەی عێراقیش لە سوننەکانن، ئەمەش دەبێتە هۆکارێکی ترسناك لە پێکهاتەی دانیشتواندا کە ئەمەش لەمپەرەکێکی گەورە دەبێت، پرسیاریش ئەوەیە: ئایە ئاشوب و فیتەی باسکردنی قەزیەی شیعەکان ترسناکترە لە فیتنە و ئاشوبی کوشتنی ئەم ژمارە زۆرە لە سوننەکان؟ و تاکەی بێدەنگی لە ئاست ئەمانە، لە کاتێکدا هەمووالا دەزانین کە ئێران پاڵپشتی تەواوی کردارەکانی کوشتنی سوننە تەنها لەسەر ناسنامە دەکات؟

چـــوارەم:

چاوتێبڕینی ئێران لە خاکی عێراق روون و ئاشکرایە، تەنانەت ئاشکرا و راشکاوانەیە، پێشتر شەڕێکی دورودرێژی هەشت ساڵەی تەواو لە نێوان ئەم دوو وڵاتە بەردەوام بوون، بەڵام ئێستا رێگەکە کرایەوە، بەتایبەت عێراق کە زۆرینەی ئاینی شیعەیە، چونکە شوێنی پیرۆز و مەزارگەی شەش لە ئیمامی شیعەکانی لەخۆ دەگرێت،

قەبری ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی تالیب (رضي الله عنهم) لە شاری نەجەفە، و قەبری حوسەینیش(رضي الله عنهم) لەشاری کەربەلایە، هەرچی قەبری موسای کازم و موحەممەدی جەوادە لە کازمیەی شاری بەغدان، بەڵام قەبری موحەممەدی هادی و حەسەنی عەسکەری لە شاری سامەرا، ئەمە سەرەڕای چەندین قەبری تری خەیاڵی زۆرێك لە پێغەمبەرانی وەکو ئادەم، نوح و صالح لە نەجەفی ئەشرەف، ئەمانە هەموویان - هەروەکو ئاشکرایە - راست نین. ئەوەی ترسناکی ئەم چاوتێبرینەی شیعەکان لە عێراق زیاد دەکات، ئەوەیە کە ئەمریکا لەپشت ئەم تەماع و چاوتێبرینەیە، هەموو دەبینین کە ئەو حکومەتە شیعەی ئەمریکا چاودێری و پشگیری دەکات، و سیناریۆکانی یەکتر تۆمەتبارکردنی ئێران و ئەمریکی بەراستیان نییە، هەرگیز ئەمریکا بیر لە لێدانی ئێران ناکاتەوە، هەروەکو لە ووتاری "باعەباعی ژێر دەسەڵات" دا باسکراوە، بەڵام ئەوەی زیاتر نیگەرانمان دەکات ئەوەیە کە چاویان لە نەوت یان سەروەت و سامانی عێراق نییە، هەروەها چاویان لەوەش نییە تەنها فراوانکردنی دەسەڵاتی شیعەکان، بەڵام نەهامەتییەکە ئەوەیە کە ئەم تاوان و وەحشیگەریانەیانە بۆتە بەشێك لە ئایین لەلای شیعەکان..

شیعەکان صەحابە و شوێنکەوتووانی صەحابان لە سوننەکان بەوانە لەقەڵەم دەدەن کە دژایەتی ئالوبەیت دەکەن، بۆیە ناوماندەنێن ناصبی یان نەواصب (واتە دوژمنانی ئالوبەیت)، لەگەڵ ئەوەی ئێمە لە شیعەکان زیاتر قەدر و رێزی ئالوبەیت دەگرین، سەرئەنجامی ئەم تۆمەتبارکردنە بڕیاری ترسناك لێیانەوە دەردەچێت، خومەینی بۆنموونە

دەڵێت: (( بەهێزترین ڕا ئەوەیە کە ماڵی ناصبی (واتە سوننی، بەزاری ئەوان) وەکو ماڵی دوژمنی جەنگ وایە لەحەڵاڵی ئەوشتەی بەغەنیمەت لەجەنگدا بەجێدەمینێت لەپاشیاندا و پێنج یەکیشی تێدا پەیوەست دەبێت، لەوەش بەهێزتر ئەوەیە لە هەرشوێنێکدا بوو جائیزە ماڵەکەی لێبسەندرێت بە هەر شێوەیەك بێت لە شێوەکان، وە پێویستیشە پێنج یەکیشی لێبدرێت.))[1].

کاتێك پێشەوایان، موحەممەدی صادقی روحانی پرسیاری لێکرا سەبارەت بە حوکمی ئەو کەسەی کە نکۆڵی بوونی پێشەوایەتی دوازدە ئیمامەکە دەکات، قسەیەکی سەرسوڕهێنەری کرد! ووتی: پێشەوایەتی لە رووی پلە پایەوە لە پێغەمبەرایەتی گەورەترە، وە تەواوکردنی ئاینیش بەهۆی دانانی پێشەوای بڕوادارانەوە (سەلامی لەسەر بێت) بە ئیمامەوە بوو، و خوای گەورەش دەفەرمووێت:

﴿ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ﴾ سورەتی المائدە: ٣.

(ئەمرۆ دینم بۆتان تەواوکرد)، هەرکەسەکیش بڕوای بە پێشەوایەتی دوازدە ئیمامەکە نەبێت بەکافری دەمرێت))[2]. لە ووتاری "بنەچەی شیعەکان" دا باسمان کرد کە خومەینی لە پەرتوکەی دا بەناونیشانی حوکمەتی ئیسلامیدا باس دەکات و دەڵێت ئیمامەکان دەگەن بە پلە و

---

(١) خومەینی: تحریر الوسیلە بەرگی ١ لاپەرە ٣٥٢.

(٢) سەیری ئەم فەتوایایەی سەید موحەممەدی صادق ی روحانی بکە، لە لینکی .www.imamrohani.com

پایەك کە نە هیچ فریشتەیەکی نزیك لە خوا، نە هیچ پێغەمبەرێك نایگا بەم پلە و پایەیە، ئیعتراف نەکردن بە ئیمامەکان ستەمەکەی گەورەترە لە ئیعتراف نەکردن بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەمەش روانگەی بەکوفر دانان لەلای ئەوانمان بۆ دەردەخات، و هۆی بەدواکەوتنی بەحەلالزانی خوێنی سوننەکانی عێراق و وڵاتی تر، پاشانیش، حەتمیەتی داگیرکردنی عێراق لەبەر شوێنە پیرۆزەکانی شیعەکان کەوێدان، بەدەستی کەسانێکەوەیە کە ئەوان بەکافریان دادەنێن.

پێنجـــەم:

هەڕەشەی راستەوخۆ تەنها بەئەندازەی عێراق کۆتاینایەت، چاوتێبڕین لە وڵاتانی ناوچەکە زیاترە، شیعەکان بەحرەین بە بەشێك لە ئێران لەقەڵەم دەدەن، ئەمەش بەراشکاوی لەلایەن سەرۆکی پشکنینی گشتی عەلی ئەکبەری وتەبێژی نوری یەوە لە نوسینگەی سەرکردەی شۆرشەوە لە میانەی ئاهەنگی یادی سی و سێ ساڵەی شۆرشی ئێرانی دا ئاماژەی پێکرا، کاتێك گووتی: بەراستی، بەحرێن لەبنەرەتدا بریتیبوو لە چاردەهەم پارێزگای ئێرانی،و لەلایەن یەکێ لە نوێنەرانی ئەنجومەنی راوێژی نیشتمانی ئێرانی یەوە نوێنەرایەتی دەکرا.

لێمان شاراوەنییە، ئێران سێ دوورگەی گرنگی ئیماراتی لە کەنداوی عەرەبیدا داگیرکردووە، و بەهەمان شێوە لەئیماراتدا ژمارەیان بەشێوەیەکی بەرچاو روو لەزیاد بوونە، تا ئەو رادەیەی رێژەیان لە ١٥٪ دانیشتووانی ئیمارات پێکدەهێنێت، و دەستیان بەسەر ناوەندەکانی بازرگانیدا گرتووە، بەتایبەت لە دوبەیی.

بارودۆخی سعودیەش بەهەمان شێوە ناجێگیرە، لەوەتەی شۆڕشی ئێرانی یەوە لە ساڵی ١٩٧٩ز وە چەندین جا بارگرژی دووبارە بۆتەوە لە سعودیەدا، چەندین جار خۆپشاندان لە قەتیف و سەیهات، سەختریانیان لە ١٩ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٩ ی زاینی بوو، جاری واهەیە تەنگژە و بارگرژیەکان ئەوەندە خراپ دەبێت تا رادەیە خۆپشاندان و




ئاژاوە نانەوە لەناو ماڵی خوادا، هەروەکو ئەوەی لە وەرزی حەجی ساڵانی ١٩٨٧ و ١٩٨٩ی زاینیدا، تەنانەت دوا بەدوای روخانی رژێمی صەدام حوسەین ٤٥٠ کەسایەتی شیعە لە سعودیادا هەڵسان بە پێشکەشکردنی داواکاریەکەك لە ئەمیری ئەو کاتە، ئەمیر عەبدوڵلا، کە تێیدا داوای پۆستی بەرز لە ئەنجومەنی وەزیران و دیبلۆماسی و ئەجهیزەی سەربازی و ئاسایش دا دەکرد، هەروەها داوای بەرزکردنەوەی رێژەی خۆیان لە ئەنجومەنی راوێژ (پەرلەمان) دا دەکرد.



لەڕاستیدا، عەلی شەمخانی، گـەورە راوێژکاری سـەربازی ئێـرانی، بـەراشـکاوی لـەلای رێبەری باڵای شۆرشی ئێرانی ڕایگەیاند: لەکاتی لێدانی بنکە ئەتۆمیـەکانی ئێـران لەلایـەن ئەمریکاوە ئەوا ئێران وازناهێنێت تەنها بەلێدانی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە کەنداوی عەرەبی بەڵکو بە موشەکی بالیستیکی بەکاردەهێنێ بۆ بوردومانکردنی ئامانجە ستراتیجییەکان لە کەنداوی عەرەبی و هەروەها لێدانی مزەخەکانی نەوت و وێستگەکانی وزە لە وڵاتانی کەنداوی عەرەبیدا، ئەم لێدوانەش لەلایەن گۆڤاری تایمزی بەریتانیەوە لە رۆژی یەکشەممە/١٠ ی حوزەیرانی ساڵی ٢٠٠٧ زاینی دا بڵاوکرایەوە.

## ئـــایا ئەمە هەموو شتێکە؟!

هەرگیز نا. شتی زۆر زۆر هەن تاوەکو ئێستا باسمان لێوە نەکردووە.

لەم وتارەدا باسی پێنج خاڵمان کرد کە ترسناکی و گرنگی مەسەلەی شیعەکان ڕووندەکەنەوە، پێنج خاڵی تری زۆر گرنگ هەن، کە دەترسم ئەگەر بێتوو بەخێرای باسیان بکەم مافی خۆیان پێنەدەم، بۆیە دوایان دەخەم - بە ئیزنی خوای گەورە - لەبەشی "هەڵوێستمان بەرامبەر بە شیعەکان"،دا لەوێدا شێوازی نمونەیی بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ بارودۆخەکان ترسناکەکاندا دەخەینەڕوو.

بەڕاستی، مەسەلەی شیعەکان لە چیرۆکی ئوممەی ئیسلامیدا مەسەلەیەکی پەراویزی و لاوەکی نییە، تاوەکو وابکات هەندێك کەس وازی لێبهێنن یاخود دوای بخەن. بەراستی مەسەلەیەکە کە لە شتە سەرەکییەکانی ئوممەی ئیسلامی ئەژمار دەکرێت، هەموولایەك دەزانن کە ئازادکردنی فەلەستین لەدەست خاچپەرستەکان لەسەر دەستی سەلاحەددینی ئەیوبی ڕوونەدا تاوەکو میسری لە چەنگ حوکمڕانی شیعە عوبەیدیەکاندا رزگار نەکرد، سەلاحەددینیش نەیگووت کە شەڕی خاچپەرەستەکان پێویسترە و مەسەلەی حوکمڕانی میسر لە لایەن شیعەکانەوە دوابخەین، ئەمەش لەبەرئەوەیە چونکە موسولمانان سەرناکەون تەنها بە بیروباوەڕی پاك و راست دروست نەبێت، بۆ سەلاحەددین نە دەگونجا کە گەلی میسری بەگەرە خۆی بدات تاوەکو شەری لەگەڵ بکەن لەسەر مەسەلەی میسری تەنها بۆ ئەوەنەبێت تا فەرمانڕەوایەتی بیدعەی عوبەیدەکان لەکۆڵی میسریەکان بکاتەوە، ئەوەی کە سەبارەت بەمافی میسر باسمانکرد، ئێستا سەبارەت بە مافی عێراقی و هەموو دەوڵەتێکی ژێر هەرەشەی شیعەکانیش باسی لێوەدەکەین، دەبێت لەمێژوودا پەند وئامۆژگاری وەربگرین.

# ٣-١ چیرۆکی حیزبوڵلا

یەکێك لەو نمونانەی کە زۆرینەی موسلمانانی لەم چەند ساڵانەی دواییدا دەستخەرۆداوە بریتییە لە نمونەی حیزبوڵلا ی لوبنانی و سەرکردەکەی، حەسەن نەسروڵلا، ئەوکەسەی کە گۆڤاری نیوزویکی ئەمریکی بە کاریزمیترین کەسایەتی جیهانی ئیسلامی، و کاریگەرترین کەس لەسەر دڵ و دەروونی موسولمانان، وەسفکرد.



زانا و بیرمەندە ئیسلامیەکان جیاوازیەکی دیار ناشکرایان هەیە سەبارەت هەڵسەنگاندنی ئەم حیزبە و سەرکردەکەی، حەسەن نەسروڵلا، هەیانە بەکوڕەوەری بەرگری لێدەکات، تا ئەو ڕادەیەی حەسەن نەسروڵلا بە خەلیفەی موسلمانان ناودەبات، هەیانیشە هەندە بەتوندی هێرشی دەکاتە سەر، تا ئەو رادەیەی بەتەواوەتی هەر لەئیسلامیشیان دەبەنەدەرەوە، دەیان راوبۆچوون سەبارەت بەم دوو لایەنە هەیە.

باشە راستییەکەی ئەم باسە لەکۆێیە؟ و ئایە دەکرێت گوێرببین بە دەستکەوتەکانی حیزبوڵلا؟ و ئایە پێویستە لەسەرمان بە سومبولێکی

دابنێین و پارێزگاریشی لێبکەین، یاخو دەبێت خەڵکی لە مەترسییەکانی ئاگاداربکەینەوە؟ و یاخود دەبێت قوتابخانەی بێدەنگی بکەینەوە، کە زۆربەی موسلمانان بە چاکی دادەنێن: پێویست ناکات ئێستا ئەم لاپەرەیە بکەینەوە؟ یاخود بێدەنگی هیچ مایەکی نییە؛ لەکاتێکدا ڕووداوەکان بەردەوامن، و کێشەکانیش خراپتردەبن، هەروەکو دەشزانن ئەوکەسەی لەئاست حەق و ڕەوادا بێدەنگ دەبێت شەیتانێکی لاڵە؟!

پێویستە بۆئەوەی لەشتێك تێبگەین، هەروەکو لە ووتارەکانی ڕابردوودا لەسەری ڕاهاتین، هەردەبێت بگەڕێنەوە سەر ڕەچەکی، لەسەرەتادا پێویستە لەچیرۆکەکە تێبگەین، دەبێت بزانین چۆن و لەچ بارودۆخێکدا حیزبوڵلا دروستبووە. بەهەمان شێوە پێویستە لە چیرۆکی دامەزرێنەر و بیروباوەڕ و شێوازی بیرکردنەوە و ئاوات و ئامانج و هۆکاری گەیشتن بەو ئامانجانەیان بزانین، ئینجا زۆر بابەتی لێڵ و ناروونمان بۆ ئاشکرا دەبێت، ئەو کات ئەقلمان لە ئاراستە کردنی هەست وسۆزمان دا بەکاردەهێنین، چونکە باس و خواسی ئەقڵ شتێکە و باس و خواسی هەست و سۆزیش شتێکی ترە.



## چۆن حیزبوڵلا دروست بووە؟

حیزبوڵلا لە وڵاتی لوبنان دروست بووە، و وڵاتی لوبنانیش خاوەن تایبەتمەندیەکی تاکە کە بەهۆیەوە لە هەموو وڵاتانی تری جیهان جیادەکرێتەوە؛ بەشێوەیەکی سەیر دەوڵەتێکی مەزهەبی یە، بەشێوەیەك کە ١٨ مەزهەبی دانپیانراو لەسەر خاکەکەی دا دەژین، لەوانەیە سروشتە شاخاویەکەی وایکردبێت کە ئەم مەزهەبە ناکۆکانە لەگەڵ دەسەڵات پەنای بۆبەرن، لەگەڵ جیاوازی مەزهەبەکانیشدا دیانەکانیش بوونیان هەیە لە لوبناندا، بەهەمان شێوە شیعە و دورزو و مەزهەبەکانی تریش بوونیان هەیە. لوبنانیەکان لەنێوان خۆیاندا دان بەسێ چین دەنێن، ئەوانیش: تایفەی موسڵمانە سوننیەکان و تایفەی شیعەی دوازدە ئیمامی و تایفەی دیانی مەوارینیەکانن، پاش ئەمانە بەرێژەیەکی زۆر دوور دوروزیەکان دێن، کەئەمانە لەسەر موسلمانان ئەژمارکراون، ئەگەرچی بەمشێوەیە نین (واتە موسلمان نین). لەڕاستدا، ئیستیعماری فەرەنسی زۆر سوربوو کە چووە ناو لوبنان لە ساڵی ١٩٢٠ی زاینیدا کە ئەم فرەمەزهەبیە بچەسپێنێت، بەڵکو جەختی لەسەرئەوە دەکردە کە زۆربەی جڵەوی دەسەڵات بکەوێتە دەست هاوپەیمانەکانی لەناو دیانە مەوارینیەکان، تەنها ئەوە نەبێت دوای وەرگرتنی سەربەخۆی لە ساڵی ١٩٤٣ ی زاینیدا دەستوری لوبنانی داندرا و پۆستی سەرۆك کۆماری بە مەوارینەکان، و سەرۆك وەزیران بە سوننیەکان، و سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانیشی بە شیعەکان بەخشی، بەڵام دەستور بەشێوەیەکی کردارەکی جێبەجێنەکرا تەنها لە ساڵی ١٩٥٩ ی زاینی نەبێت، لەپێش

ئەم بەروارەدا هەموو ناوەندەكان لەژێر دەستی مەوارینیەكاندا بوو. هەرلەبەر ئەم هەستیاریە تایفەگەریەیان، لوبنانیەكان بەتەواوی خۆیان لە ئەنجامدانی سەرژمێری دانیشتوان لەگێلی داوە، كە بەشێوەیەكی ورد بتوانن رێژەی هەر تایفەیەك رونبكەنەوە، ئەگەر چی نزیكترین شیكار دەلێت: سوننەكان ٢٦٪، بەهەمان شێوە شیعەكان ٢٦٪، لەكاتێكیشدا مەوارینیەكان ٢٢٪ ی دانیشتوان پێكدەهێنن، پاشانیش دوروزیەكان ٥،٦٪ دەنوێنن.

بەسروشتی بارودۆخەكە، هەرتایفیەك هەولّی داوە لەناوچەیەكی دیاریكراودا ناوەندێك پێكبهێنێت تاوەكو ببێتە هێزێك كە دەوروبەرەكەی بكەوێتە ژێر كاریگەریەكەی؛شیعەكان لەبەشی باشوری لوبنان و دەشتی بیقاعدا گیرساوەتنەوە، سوننەكانیش لەبەری باكووری لوبنان و ناوەراستەكەی و شارە كەناریەكانی (بەیروت و تەرابلوس و صەیدا) دا نیشتەجێ بوون، لەكاتێكدا مەوارینیەكان لەناو چیای لوبنان و هەروەها بەیروتی رۆژهەلاتیشدا نیشتەجێن.

لەوانەیە نیشتەجێبوونی شیعەكانیش لە باشوری لوبناندا راڤەی ئەو بەكڤاچوونەوەی لەگەڵ جولەكەكانمان بۆ بكات كە لەم دەساڵەی دوایدا روویدا، بەگژیەكترداچوونەكە - هەروەكو لەمەودوا بەئیزنی خوای گەورە روونی دەكەینەوە - بریتی نەبوو لە بەگژاچوونەوەیەكی ئاینی نەبوو، هەروەها لەپێناوی خوای گەورەش نەبوو، هەروەها لەپێناو ئازادكردنی فەلەستینیش نەبوو، بەڵكو تەنها لەبەر ئەوە بوو چونكە ناوچە سەرەكییەكانی ژێر دەسەڵاتیان رووبەڕووی لەدەستچوون بووبوونەوە، بۆیە جگە لەبەرگریكردن شتێكی تریان نەبوو، ئەگینا

چیرۆکە بەتەواوەتی کۆتایی پێدەهات، بەڵام ئەگەربهاتایە هێرشی جولەکەکان بۆسەر ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی سوننەکان ببوایە ئەوا بەدڵنیاییەوە شیعەکان بە ئەندازەی مێرولەیەکیش جولەیان نەدەکرد.

موسای صەدر ڕەگوریشەی چیرۆکەکە
دەگەڕێینەوە سەر ڕەگوڕیشەی چیرۆکەکەمان..

لەڕاستیدا، سوننە و شیعەکان تاڕادەیەکی زۆر بەپەراوێزکراوی دەژیان لەتەك مەوارینیەکانی پالپشتیکار لەگەڵ فەرەنسا و کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، بەڵام سوننە و شیعەکان دەستیانکرد بە گەڕان بەدوای خودی خۆیان و هەوڵی خۆچەسپاندیان دا، بەتایبەت لە کۆتایی پەنجاکاندا. لەوکاتەی کە سوننەکان ئەوکەسەیان لەدەستدابوو کە کێشەکەیان هەڵبگرێت، و پرۆژەکەیان بخاتە باری جێبەجێکردنەوە، بەتایبەت لەگەڵ ئەو هەڵکشانە نەتەوەیی ئیشتراکی یەی گشت جیهانی عەرەبی گرتەوە لەو سەردەمەدا، لەم کاتەدا شیعەکان شوێنی هەناسە وەرگرتنێکیان چەنگ کەوت، کاتێك کە یەکێك لەو شیعە کاریگەرانەی کەشوێن پەنجەی دیاریان لەسەر نەخشەی لوبناندا هەیە، هاتە ناو خاکی لوبنانەوە، ئەویش بریتی بوو لە موسای صەدر، ئەمەش لەساڵی ١٩٥٩ی زاینیدا بوو.

موسای صەدر لە شاری قوممی ئێرانی لە ساڵی ١٩٢٨ی زاینیدا لەدایك بووە، هەرلەێشدا مەزهەبی شیعەی دوازدە ئیمامی خوێندووە، و بۆتە وانەبێژ لە زانکۆی قومم و وانەی فیقە ومەنتقی دەگوتەوە، دواتر لە ساڵی ١٩٥٤ زاینیدا گوازراوەتەوە شاری نەجەف

لەعێراق بۆئەوەی خوێندنە شیعەگەریەکەی لەسەر دەستی گەورە مەرجیعەکانی وەکو موحسینی حەکیم و ئەبو قاسیمی خوئیدا تەواو بکات، و دواتریش لە ساڵی ١٩٥٩ی زاینیدا چووە لوبنان و تاوەکو کۆتایی تەمەنی لەوێدا مایەوە.

## موسای صەدر هاتە لوبنان و دوو ئەرکی گرنگی بێیە:



هەرچ ئەرکی یەکەمە بریتی یە لە پرۆژەی شیعی دینی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی شیعی لە لوبنان، و دەیەوێت کە دەوڵەتێك دابمەزرێنێت لەسەر بنەمای مەزهەبی شیعەی دوازدە ئیمامی بە هەموو بیروباوەر و بیرۆکە لەسەر رێلادراوەکانی و بەهەموو بیدعە خراپەکانیانەوە، هەروەکو لە ووتاری "رەچەڵەکی شیعەکان" دا بەتێرو تەسەلی باسم لە سەرلاهەڵدان و ئەو ئەفکارانەی کە شیعەکان باوەریان پێیهەیە. لەگەڵ ئەوەی شیعەکانی لوبنان لەوکاتەدا دیندارنەبوون، بەو واتایەی ئەوان تەنها بەناو شیعە بوون، بەڵام هیچیان سەبارەت بە سروشت و بنەماکانی مەزهەبەکەیان نەدەزانی.

هەرچی شتی دووەمە کە ئەو هەڵیگرتبوو، بریتی بوو لە برێکی زۆر لەو ماڵ و سامانەی کە جێبەجێکردنی پرۆژەکەی بۆ ئاسان دەکات، ئاشکراشە کە مەرجیعەکانی شیعە لەجیهاندا خاوەنی سەروەت و سامانێکی زۆرە، چونکە شیعەکان پێنج یەکی (٢٠٪ تەواوی)

داهاتی خۆیان دەبەخشن بە مەرجیعەكانیان، لە روانگەی ئەوەی كە ئەوان لە ئالو بەیتن، ئائەم سەروەت و سامانەش تەنها و تەنها بۆ ئەوانە، بە ویستی خۆیان هەڵسوكەوتی پێدەكەن، وەبەهۆی ئەوەشەوە دەستدەگرن بەسەر بەرێوەبردنی كاروبارەكاندا كە بەهۆیەوە هێزێكی ئابووری زەبەللاح پێكدەهێنن.

## شیعەكان و دژایەتی كردنی فەرمانڕەوایەتی سوننەكان

بەڕاستی، لەبنەراتدا مەزهەبی شیعەكان تەنها بریتییە لە چەند شۆرشێك كە لەدژی سیستەمی فەرمانڕەوایەتی بەمەبەستی دەستبەسەرداگرتنی دەسەڵات، بە شێوەیەك كە كەلەگەڵ رێبازی سوننە ناكۆكە و دژایەتیشی دەكات، بەدڵنیاییەوە شیعەكان لە دەستبەسەر داگرتنی روبەرێكی فراوانی جیهانی ئیسلامیدا لە قۆناغە جیاجیاكانی مێژوودا، چونكە بە روون و ئاشكرای شوێنەواری نەرێی قێزەوەنی ئەوان بەدیاركەوتووە لە هەر شوێنێكدا فەرمان بەدەستبوون، بەڵام بە رووخانی دەوڵەتی صەفەویەكان لەناوەڕاستی سەدەی هەژدەمی زاینیدا شیعەكان فەرمانڕەواتی كردنیان لە هەموو دونیادا لەدەستدا،و پڕۆژەكەیان بۆماوەیەكی دوور و درێژ كزبوون. بەڵام سەرلەنوێ فیكرەی خۆسەپاندن لە پەنجاكاندا بەدیاركەوتەوە، و مەیل و ویستێكی كۆێرانەیان هەبوو بۆ دروستكردنی دەوڵەتێك كە بیروباوەڕی مەزهەبی گۆمڕای دوازدە ئیمامی بەهێزی دەسەڵات و چەك بڵاوبكاتەوە، شوێنە دەستنیشان كراوەكانیش بۆ ئەم دەوڵەتە لە سێ شوێن دەرنەدەچوون كە ئەوانیش: ئێران و عێراق و لوبنان

بوون، لەبەرئەوەی ژمارەکی زۆر لەو شیعانەی لەوێدا بوونیان هەیە ڕێگەخۆشکەربوون بۆ دروستکردنی دەوڵەتێك.

بێگومان،کرۆکی شیعەکان خەریکی پلان دانان بوون بەمەبەستی دروستکردنی دەوڵەتێك لە یەکێك یاخود لەهەرسێك لەو دەوڵەتانەدا، هەروەها کەسەکانیشیان بەسەر ئەم ناوچانەدا دابەشکرد، هەبوو لەناو چەرگەی رژێمەکە کاریدەکرد، لە سەروی ئەمانەوە خومەینی بوو، بەهەمان شێوە هەبوو بۆ ئەم مەبەستە لە عێراقدا کاری دەکرد، هەبوو بۆ کارکردن نێردرا لوبنان، ئەویش موسای صەدر بوو.

لەڕاستیدا، ئەمە کارێکی تێهەڵکێش و ئاڵۆز و لەسەرخۆ بوو، هێچ شتێك ڕێگر نەبوو لەبەردەم سەرکەوتنی لەپاش تێپەرینی دەیان ساڵ، گرنگ ئەوە بوو تەواو بێت، ئەمەش هەمان شێوازی دروستکردنی حکومەتە شیعیەکانی وەکو حکومەتی بویهیەکان، و عوبەیدیەکان-کە بەدرۆ بە حکومەتی فاتمیەکان ناوەزەدیان کردبوو- و جگە لەمانەش، عادەتەن ئائەم جۆرە ڕێکخراوانە کار لەگەڵ چینی زەحمەتکێش و گەل و هەژاراندا دەکەن، و رۆحی کودەتا بەسەر دەوڵەمەند و خاوەن باڵاخانەکاندا لە نێوانیاندا بڵاودەکەنەوە، و مەسەلەی شۆرش کە لە ناخی شیعەکاندا رەگ و ریشەی داکوتاوە دەورژێنێت، دواتریش کودەتا رودەدات و حوکمەتی شیعەکان دامەزرێت.

بێگومان، لەمێژوو و لە ئێرانیشدا کاری وام بینیووە، ئەگەر خوا حەزبکات، کات دەرفەتمان دەدات کە لێرەدا بەدرێژی باسی شۆرشی شیعەکان بکەم، ئێمە ئێستا خۆمان بەڕوونی هەنگاوەکانی ئەم شۆرشە لە لوبنان و عێراقدا دەبینین، ئەگەر ئەم کارەش لەم دوو دەوڵەتە تەواو

بوو، ئەوکاتە فراوانبوونەکە سوریا و کوەیت و بەحرەین و هەرێمی ڕۆژهەڵاتی سعودیەش دەگرێتەوە، بۆیە پێویستە ئەم قسانە بنوسرێنەوە، و موسلمانانیش لە ڕووداوەکانی دەوروبەریان تێبگەن.

## پلانی دامەزراندنی دەوڵەتێکی شیعی

بابگەڕێینەوە بۆ چیرۆکەکەی لوبنان..




موسای صەدر نێردرا بۆ لوبنان بەمەبەستی پلاندانان بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی شیعی، موسای صەدریان لەبەر ئەوە هەڵبژاردبوو، چونکە لەبنەڕەتدا لوبنانی بوو، لەتەك زمانی فارسیەکەی عەرەبیەکی باشیشی دەزانی، پەیوەندی و هەماهەنگییەکی باشیش لەنێوان ئەو و خومەینیدا هەبوو، تەنانەت پەیوەندیەکی پتەوتر لە پەیوەندی سیاسی هەبوو لەنێوانیاندا؛ ئەحمەدی خومەینی، کە دەکاتە کوڕی خومەینی، مێردی کچە خوشکی موسای صەدر بوو، بەهەمان شێوە کوڕی موسای صەدریش مێردی نەوەی خومەینی بوو، لەهەمان کاتدا موصتەفا خومەینیش لە هاوڕێیە نزیکەکانی موسای صەدر بوو.

موسای صەدر ڕاستەوخۆ ڕوویکردە باشووری لوبنان چونکە شیعەکان بەچڕی تێیدا نیشتەجێبوون، سەرەتا لە ڕوانگەیەکی کۆمەڵایەتی دوور لە دەرخستنی شێوازێکی ئاینی ڕوون دەستی بەکارەکەی کرد، ئەویش هەڵسا بەدامەزراندنی دەزگای خزمەتگوزاری بۆ یارمەتیدانی هەژار و خاوەن پێداویستیەکان، و قوتابخانە و نەخۆشخانە، و پاشانیش ڕێبازی شیعەگەریەکەی خۆی هێواش هێواش بەدیار دەخست، دواتر دادگای جەعفەری دامەزراند، کە بە مەزهەبی شیعەی دوازدە ئیمامی فەرمانڕەوایەتی شیعەکانی دەکرد. سروشتی تایفەگەری و فرە نەتەوەی لوبنانیش دەرفەت و شوێنی کارکردنی بە موسای صەدر دەدا، بەتایبەت لەگەڵ ئەو لاوازیە زۆرەی حوکمەت و سەربازی ئەو کاتەی لوبنان.

موسای صەدر پیاوێك بوو بەهەموو دۆڵێك دەیکوتی، بەمەبەستی گەیشتن بە ئامانجەکەی دەستی دەخستە ناودەستی هەموو کەسێك، هەر لەسەرەتاوە زانیبووی کە مەسیحیە مارۆنیەکان بەهێزترین دەسەڵاتی ئەوکاتەی لوبنان بوون، هەروەها سوننیەکانیش نەیاریان بوون، سەرەڕای ئەوەی سوننەکانی ئەو کاتیش پابەندی ڕێنماییەکانی سونە یان ئاینی ئیسلامی نەبوون، بەڵکو -تەنها ئەوەی خودای گەورە ڕەحمی پێکردبێت- ئەگینا ئەوانی تر لەسەر ڕێبازی رەگەزپەرستی و ئیشتراکی و عەلمانیەت دەڕۆیشتن.

موسای صەدر خۆی لە لایەنی مەسیحی نزیککردەوە، چونکە شیعەکان-هەروەکو لەسەرەتاوە دەزانین- شتێك نیە جگە لە هەڵسان و ڕاپەرین لەدژی ڕێبازی ئیسلامی سوننی، و ڕەتکردنەوەی چیرۆکی

ئیسلام پێداوەرە هەرلە ئەبو بەکر صدیق و عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزا و ڕەحمەتی خوا لە هەردووکیان بێت)، و تاوەکو هەموو دەوڵەتە ئیسلامیە سوننیانەی کە حوکمڕانی ئوممەتەکەمانی کردووە، هەر لەبنەڕەتدا بیرۆکەی حوکمەتەکەی بریتی بوو لە بەرەنگاربوونەوەی سوننەکان.

لێرەوە، موسای صەدرِ ڕوویکردە لای شارل حولوی مارۆنی سەرۆکی ئەوکاتەی لوبنان، و ڕووینەکردە لای سەرکردە سوننەکانی بۆ کۆکردنەوەی هێزی موسڵمانان، شارِل حولو موسای صەدری بە هاوپەیمانێکی گونجاو زانی لەدژی شەقامی سوننی دا، بۆیە لەخۆی نزیکردەوە و هانیشیدا. لەپاشاندا، لەساڵی ١٩٦٧ ی زاینیدا ڕازی بوو لەسەر دروستکردنی ئەنجومەنی ئیسلامی شیعی باڵا بۆ ئەوەی ببێتە نۆێنەری شیعەکانی لوبنان، تەنانەت، شارل حولو ڕەزامەندی نیشاندا سەبارەت دەرکردنی بریاری یاسای ژمارە ٧٦/٧٢ نیشاندا، یاساکە بڕیار دەدات بەوەی کە هیچ ڕێگرێك نییە لەبەرامبەر ئەوەی کە ئەنجومەنی شیعی لە فەتوا و بڕیار و یاساکانیدا بگەڕێتەوە بۆ لای مەرجەعە گەورەکانی شیعەکان لەجیهاندا (واتە لە ئێران و عێراق،. هتد)، هەروەها گەڕانەوەش بۆ یاساکانی لوبنانیش پێویست ناکات!!

ئەم ئەنجومەنەش لە ساڵی ١٩٦٩ی زاینی دامەزرێنرا و موسای صەدریش بوو بە یەکەم سەرۆکی ئەم ئەنجومەنە، و لە ساڵی ١٩٧٠ دا حوکمەت دانیپێدانا، و بریاریشیدا لە سەر خەرجکردنی دە ملیۆن دۆلار وەك یارمەتی بۆ شیعەکانی باشووری لوبنان.

موسای صەدر ئەوەشی لەیاد نەکرد کە شوێنپێی خۆی لەلای ئەمریکادا بکاتەوە؛ لە دیدارێکیدا لەگەڵ باڵوێزی ئەمریکیدا باسی ئەوەی کرد کە ئەو بەرگری دەکات لە پشتیوانی ئیشتراکی لە ریزی گەنجانی شیعە لە لوبنان، باس و خواسی پەیوەندی موسای صەدر لەگەڵ ئەمریکادا ناوبانگی هەبوو، تەنانەت لە نێزیەکانی خومەینیش موسای صەدریان تۆمەتباردەکرد، لەوقۆناغەشدا خومینی ئەمریکای بەترسناکیەکی گەورە وەسف دەکرد، چونکە ئەمریکا بە توندی پاڵپشتی لە شای ئێرانی دەکرد.

١٩٧٠ ی زاینیدا، گۆرانکاریەکی ئەوتۆ روویدا کە پێچەوانەی ویستی موسای صەدر بوو، چونکە ئاوارە فەڵەستینیەکان لە ئوردن دا دووچاری قەسابخانەیەك بوونەوە، کە لە مێژوودا بە ئەیلولی رەش ناسراوە، دواتریش هەموو فەلەستینیەکانیش بۆ لوبنان راگوێزران بە سەرکردایەتی حیزبی فەتح، بەبێگوێدانە حەزی شیعەکان ئاراستەی ئەم ڕاگوێزانە بەرەو باشووری لوبنان(لەنزیك فەلەستین) بوو، تەنها ئەوەندە نەبێت فەلەستینیەکان سوننین، ئائەمەش بووە مایەی ڕاگرتنی پرۆژەی دروستکردنی حکومەتی شیعەکان، هەرچەندە ئەوکات ئاراستەی حیزبی فەتح ئاراستەیەکی ئیشتراکی و عەلمانی بوو، دوور دوور بوو لە رێنمایی و تەعالیمی ئیسلامییەوە.

سەرەڕای ئەمە، موسای صەدر کەڵکی لەم قۆناغەی گەڵ حیزبی فەتح وەرگرت، پەیوەندیەکی دوستانەی لەگەڵدا دروستکرد؛ تاوەکو دواتر فەتح هەڵسێت بە مەشق و ڕاهێنان کردن بە شیعەکان لە رووی سەربازیەوە، بەمەبەستی خۆئامادەکردن بۆ دروستکردنی میلیشیای چەکداری



کەکاریگەری لەسەر ڕێڕەوی لوبنان هەبێت، حیزبی فەتحیش - لەهەمان کاتدا - لەدوای هاوپەیمانێکدا لە تەك شوعیەکان دەگەڕا، بۆیە پەیوەندیەك لەسەر بنەمای سود و قازانج لە نێوانیاندا دامەزرا.

لەساڵی ١٩٧١ی زاینیدا، حافز ئەسەد چووە سەر کورسی دەسەڵات لە سوریادا کەلە بنەماڵەی عەلەویە نوصەیریەکانە، عەلەویەکانیش بنەماڵەکی لە ئیسلام دەرچوون ئەگەر چی لەرووی سیاسیەوە لەسەرئیسلامیش حیسابکرێت، ئەوان ئیمامی عەلی (رەزا و رەحمەتی خوای لەسەربێت) بە خوا دەدەنێن و دەیپەرستن-پاك و بیگەردی بۆ خوا- سەرەڕای ئەمەش موسای صەدریش بە پەلە فەتوایەکی دەرکرد تێیدا ئاماژەدەکات بەوەی کە عەلەویەکان شیعەن، بەمەش حافز ئەسەد بە موسلمان دادەنرێت! ئەمەش بووە مایەی نزیکبوونەوەیەکی توند لە سوریا و رژێمە دەسەڵاتدارەکەی، بەم شێوەیە موسای صەدر بووە ئامرازی بەیەکگەیشتنی نێوان حافز ئەسەد و سەرکردەکانی شۆرشی ئێرانی، تەنانەت حافز ئەسەد دوای شۆرشیش پشتیوانی ئێران بووە لە جەنگی لەگەڵ عێراقدا، ئەمەش لە رقی صەدام حوسەین.

ئابەم شێوەیە موسای صەدر تۆوی دەوڵەتە شیعیە تۆیەکەی دادەنێت، بۆ ئەم مەبەستەش یارمەتیەکی چاکی لە مەراجیعە دینیە گەورەکانی تایبەت بەخومەینی، و دیانەکانی لوبنان و ئەمریکا و سوریا و تەنانەت لە فەتحی بەحیساب سوننی یەوە وەردەگرت.

لەساڵی ١٩٧٤ی زاینیدا، موسای صەدر بزوتنەوەی بەشخوراوەکان (حرکە المحرومین) ی دامەزراند، کە داوای مافی زیاتری بۆ هەژاران دەکرد، لەسەرەتادا ژمارەیەکی زۆر لە مەسیحیەکان لە باشووری لوبناندا چوونە ریزەکانی ئەم بزوتنەوەیە؛ بەگومانی ئەوەی کە ئەو بزوتنەوەیە بزوتنەوەیەکی نەتەوەییە و هەژارەکانی لوبنان لە قەیران رزگار دەکات، بەڵام دوای ئاراستەی شیعەگەریان لەناو بزوتنەوەکە بۆ ئاشکرابوو وازیان هێنا و دەرچوون، پاشان هەندەی نەبرد صەدر رێکەوتنامەیەکی لەگەڵ یاسر عەرەفاتی سەرکردەی بزوتنەوەی فەتح بەمەبەستی مەشق پێکردنی بزوتنەوەی بەشخواراوەکان لە رووی سەربازیەوە مۆرکرد، لەژێر گوێڕایەڵی و چاودێری حوکمەتی لوبنانی بێهێزدا.

لە تەمموزی ١٩٧٥ی زاینیدا، صەدر بڕیاری پێکهێنانی باڵێکی سەربازی لە بزوتنەوە بەشخوراوەکان ڕاگەیاند و ناوینا (فەوجەکانی بەرگری لوبنانی)، کورتکراوەکەیشی بە بزوتنەوەی (ئەمەل) ناسراوبوو، بە بێگومان صەدر خۆی سەرکردایەتی ئەمەلیشی دەکرد.

هەندەی نەبرد موسای صەدر خۆی لە فەڵەستینیەکان نەناسکرد و بەتەندیش داوای لێکردن کە سوننە فەڵەستینیەکان باشووری لوبنان جێبهێڵن، و- لەدوای ئەمە - دەبینین کە لە ماوەی ساڵانی ١٩٨٥ - ١٩٨٨ی زاینیدا شوێنکەوتووەکانی لە بزوتنەوەی ئەمەل لە شەڕی موخیەیەماتدا لە دژی فەڵەستینیەکان دەجەنگان.

لەساڵی ١٩٧٥ی زاینیدا لوبنان توشی سەرگەردانیەکی شەڕی ناوخۆیی هاتەوە، کە شەڕێکی زۆر ئاڵۆز بوو، زۆر لایەنی جیاجیای ناوخۆی هاتنە ناو ئەو شەڕەوە، ئەمە سەرباری لایەنی دەرەکی کە

زیاترە، جا بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا لەم ڕووداوانە حاڵی ببین، پێویستمان بە شیکاری بە تەنهای روداوەکان هەیە.

## موسای صەدر و ناکۆکییە زۆرەکانی

دوای دامەزراندنی ئەنجومەنی باڵای شیعی و بزوتنەوەی ئەمەل، موسای صەدر بوو بەهێزێك نەك گاڵتە، وایکردبوو کە زۆرێك لە هێزەکان خۆیان لێدەپاراست، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە موسای صەدر بەهیچ شێوەیەك ئەم هێزەی خۆی نەدەشاردەوە، بەڵکو زۆر جار بەڕاشکاوی لە کۆنفرانسەکاندا هەرەشەی ئەوەی دەکرد کە بەچەکدارەکانی دەستدەگرێت بەسەر باڵاخانەکانی دەوڵەمەندان لە لوبناندا ئەگەربێتوو داواکاریەکانی جێبەجێنەکرێت، تەنانەت وای لێهات رەخنە لە هەندێك لە کارەکانی خومەینیش بگرێت، هەروەها مامەڵەی لەگەڵ زۆر لایەنی جیهانیدا دەکرد بەبێئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ئەو مەرجیعەی کە لەبنەرتدا ئەوی بۆ لوبنان ناردبوو، کارەکە تیژتر بوو لەو کاتەی کە موسای صەدر سەردانی ئێرانی کردوو لەوێدا چاویشی بە شا کەوت، و داوای لە شا کرد کە لەو پێشەوا ئاینیانەی دوازدە ئیمامیەکان ببورێت کە شا بڕیاری دابوو کە لە سێدارە بدرێن، خومەینیش ئەمەی بە دەرچوون لە ڕێکەتنامەی شیعی جیهانی و مامەڵەکردن لەگەڵ شای دوژمن شۆرشگێران لەقەلەمدا.

لە ساڵی ١٩٧٨ دا بارودۆخەکە کرژ تربوو لەو کاتەی پەیوەندی نێوان سوریا و صەدر لەناکاو تەنگژەی تێکەوت، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو چونکە سوریا دوای سەردانەکەی سادات بۆ قەوارەی جولەکە لە

ساڵی ١٩٧٧دا، لە ژێر پاڵپەستۆیەکی وڵاتانی دەوروبەر و ئەمریکادا بوو، سوریاش ویستی کە لوبنان بەهێزەوە لەگەڵدا بێت لە بەرامبەر جولەکەکان چونکە ئەو کات هێزێکی سوری لە لوبناندا هەبوو، هەروەها ویستیشی کە صەدر جگە لە سوریا لەگەڵ هیچ وڵاتێکتردا هاوپەیمانی دروست نەکات. بەڵام صەدر هەستی بە بەهێزی خۆی و لاوازی ئەو هەڵوێستەی سوریا کرد، بۆیە بە پێچەوانەی هۆشداریەکەی سوریا، ویستی پەیوەندیەکانی لەگەڵ ولاتانی عەرەبیدا پتەوتر بکات، و لێرەدا سەردانی کوەیت و دواتریش جەزائیری کرد، لەکۆتایشدا لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٧٨ی زاینیدا سەردانی لیبیای کرد، بەڵام لە ناکاو شتێکی چاوەروان نەکراوی گەورە روویدا لەوکاتەی لیبیا رایگەیاند کە صەدر لە ٢٥ ی ئابی ١٩٧٨ی زاینیدا خاکی لیبیای جێهێشتووە، بەڵام لەپاش ئەمەوە موسای صەدر لە هیچ شوێنیکی دونیادا بەدیار نەکەوتەوە (واتە بەیەکجاری بزر بوو)!!

بەڕاستی مەسەلەیەکی سەرسوڕهێنەرە؛ چونکە موسای صەدر منداڵێ نەبوو تاوەکو لە فرۆکەخانەدا بفرێندرێت، هەروەها کەسایەتیەکی ئاوا سادەش نەبوو تێپەرێت و حوکمەتیش نەزانێت بۆ کوێ چووە، بەڵام روون ئاشکرایە کە دەسگیر کرایە و دواتریش کوژرایە.

ئەو دوژمنانەی کە پیلانیان لە دژی موسای صەدر دا دەگێرا ئێستا زۆر بۆتن، پەنجەی تۆمەتیش ئاراستەی هەندێکیان درێژدەکرێت، لە پێشەوەی هەموویاندا سەرکردەکانی ئەو شۆرشەن کە ساڵێ دواتر لە ئێراندا بەرپادەبێت، کە نایانەوێت کەسایەتی کاریزمی بوونی هەبێت کە پەیوەندی هەمەلایەنەی هەبێت و کێبرکێکی خومەینیش بکات

لە پێشرەوی کردنی دەوڵەتە شیعیە نوێیەکەدا. بەهەمان شێوە تورەیی ڕژێمی سوری لەوکاتەدا مانای پیلانگێڕان بوو بۆ تیرۆرکردن، ئەوشێوازە خوێنڕێژیەی کە ڕژێمی سوریا مامەڵەی پێلەگەڵ نەیارانیدا دەکرد ناسراو و ناودار بوو، هەروەها لیبیاش خۆی لەگەڵ ئێراندا پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ سەرکردایەتی شۆرشی ئێرانیدا هەبوو، دواتریش یارمەتیشیان دەدات لە دژی عێراقدا. هەرچی هێزەکانی ناوخۆیی لوبنان بوون کە سودیان لە دەرپەڕاندنی موسای صەدر وەرگرت زۆربوون، لەسەروی هەمویانەوە شەری ناوخۆی لوبنان کە بەهێزترینان بوو.

بێگومان ونبوونی موسای صەدر بوو بە لوغزێکی سەرلێتێکدەر کە سیاسەتمەدارەکان کێبرکێ لەسەر چارەسەر و وەڵامدانەوەی بکەن، بەڵام هیچ یەکێکیان نەگەیشتۆتنە وەڵامێکی دڵنیا، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە موسای صەدر گۆرەپانەکەی بەگڕگرتووی و بزتنەوەی ئەمەلی چەکداری هەڵگری پرۆژەکەی بەجێهێشت، هەروەها پۆستێکی بەتاڵی لە ئەنجومەنی باڵای شیعەکان بەجێهێشت، ساڵێك دواتر شۆرشی ئێرانی هەڵگیرسا و شای ئێرانی ڕاماڵی، دوای تێپەربوونی چار ساڵ هێزەکانی صەهیۆنی باشووری لوبنانیان داگیرکرد. لەنێوان ئەم هەموو تەنگژە ئاڵۆزانەوە حیزبوڵلای شیعی دەرکەوت بۆ ئەوەی بەرنامەکەی صەدر تەواو بکات، بەڵام لەژێر ڕێنمای تەواوی ئێرانیدا..

چۆن ئەمە روویدا؟

چارەنووس ئەمەل چی دەبێت؟

و هەڵوێستی شیعەکان بەرامبەر فەلەستین چی دەبێت لە باشووردا؟

وە چۆن ئەستێرەی حیزبوڵلا بەدیارکەوت؟

و حەسەن نەسروڵلا کێیە؟

و بیروباوەر و ئەفکاری چۆنە؟

# چیرۆکی حیزبوڵڵا ٢-٣

زۆربەی موسلمانان ڕێگە بە هەستوسۆزیان دەدەن کە بڕیار لەسەر کاروبارەکان بدات، و هەڵسەنگاندنی کەس و ڕێکخراو و وڵاتان بکات، و بەدوای ڕاستیەکانی ژێرەوە ناگەڕێن و نێوانی ڕستەکان ناخوێننەوە، و بەدوای ڕەگ و ڕەچەڵەکی شتەکاندا ناگەڕێن، ئەمەش تۆشی تێکەڵ و پێکەڵیەکی گەورە و خراپی پێشبینی دەرئەنجامیان دەکات، و دواتریش بەهۆش خۆیان نایەوە تەنها دوای نەهامەت یان بەسەرهاتێك نەبێت، ئەوکاتەش پەشیمانی دادیانادات.

دوای ئەوەی قوڵایی ئەو هۆکارانانەمان خستەڕوو کە ببونە ڕێخۆشکەر و لانە بۆ دروستبوونی خیزبوڵڵای شیعی لە لوبنان، لێرەدا دەست دەکەینەوە بە تەواوکردنی ئەو چیرۆکەی کە پێشتر دەستمان پێکردبوو، و من دڵنیاشم لەوەی کە بە ڕێگەیەکی دڕکاوی و مەترسیداردا ڕێدەکەم، و بێگومان لە کاتی هەوڵدانم بۆ ڕوونکردنەوەی تێڕوانی موسلمانان سەبارەت بە شیعەکاندا توشی بەرەنگاربوونەوەیەکی توند دەبمەوە لە بەرهەڵستی کردن و بریندارکردنم لە لایەن موسڵمانە سۆزدارەکان لەبەرامبەر هەر نمونەیەکی سەرکەوتوودا لە قۆناغە

هەستیارەکانی ئەم ئوممەتەدا، تەنانەت ئەگەر شیعەیەکی خراپەکاریش بێت، هەندێ لەو دۆستانەی شیعەکان کە پێیان وایە کە رەخنەگرتن و لەکەدارکردنی صەحابان و بەرهەڵستیکردن لە راوبۆچوون و هەڵوێستی صەحابان جۆرێکە لە جۆرەکانی ئازادی را دەربڕین. بەهەمان شێوە دەزانم رووبەڕووی بەرگریەکی توند دەبمەوە لەلایەن شیعەکان خۆیانەوە ئەوانەی کە هانی ئەو پێنوسە سوننانە دەدەن کە بانگێشەی داخستن و باس لێوەنەکردنی ئەم دۆسییە دەکەن، و داوا دەکەن رووبکەنە قەوارەی زایۆنی و ئەمریکی تەنها، لەکاتێکدا شیعەکان بە پیلان و پلانە نەگۆڕەکانیانەوە کاردەکەن، ئەوجا لەناکاو موسلمانان بەهۆشخۆیان دێنەوە لەبەرامبەر دەوڵەتێکی شیعی گەورە بە قەبارەی، یاخود گەورەتریش لە دەوڵەتی بوهیەکان.

## دابەشبوونەکانی ئەمەل دوای موسای صەدر

لەڕاستیدا، موسای صەدر دوای ئەوەی لە شاری قومی ئێران و دواتریش لە نەجەفی عێراوە هاتە لوبنان کاری لەسەر کۆکردنەوەی شیعەکان لە یەك قەوارەی تەواودا دەکرد، بە ئەندازەیەك کە گونجاو بوو بۆ ئەوەی لە داهاتوودا ببێتە دەوڵەت، و بەشێوەیەکی ئاینی مەزهەبی گرنگی بەم قەوارەیە دەدا، بۆیە لە ساڵی ١٩٦٩ی زاینیدا ئەنجومەنی شیعی باڵایان دامەزراند، بەهەمان شێوە گرنگی بە لایەنی سەربازی داو و بزوتنەوەی ئەمەل (حركه أمل) ی دامەزراند، وشەی (أمل)یش بریتییە لەسێ پیتی یەکەمی سێ باڵی سەربازی بەرگری لوبنانی، بەهەمان شێوە پەیوەندیەکی باشی لەگەڵ مەوارینە مەسیحیەکان و

ئەمریکا و سوریاشدا پەیداکرد، بەسروشتی باردۆخەکەش، بەهەمان شێوە لەگەڵ ئەو لایەن و کەسانەی کە ئەویان بۆ لوبنان ناردبوو، لە سەروی هەموویانەوە لەگەڵ خومەینی، کە ئەوکات لە عێرقدا نیشتجێبووبوو.

لەگەڵ زیادبوونی هێزی صەدر بەرژەوندیەکانیش چەندان قات دەبووەوە، و ناکۆکییەك کەوتە نێوان موسای صەدر و سەرکردەکانی شورشی ئێرانی (بەر لە بەرپابوونیدا) بەهەمان شێوە لەگەڵ یەکێك لە پشتیوانەکانیدا، ئەویش سەرۆکی سوری شیعەی عەلەوی، حافز ئەسەد، بوو، لە بەرواری ٢٥ی ئابی ١٩٧٨ بارودۆخەکە بە رووداوێکی سەیرو چاوەڕواننەکراو کۆتایی هات، ئەویش وبوونبون موسای صەدر بوو لە لیبیادا لە میانەی سەردانێکی فەرمیدا بۆ ئەو وڵاتە.

موسای صەدر کەلێنیکی گەورەی لە گۆڕپانەکدا جێهێشت، شیعەکان هەوڵیاندا نێومالّی خۆیان رێکبخەنەوە، عەبدولئەمیری قەبلان بوو بە سەرۆکی ئەنجومەنی شیعی باڵا، کەپێشتر جێگری موسای صەدر بوو، هەر لە پۆستی جێگرایەتی مایەوە، لەکاتێکدا پۆستی سەرۆکایەتی تاوەکو ئێستاشی لەگەڵ دابێت هەر بە بەتاڵی ماوەتەوە! وایلێهات کە مەرجەعیەتی رۆحی بکەوێتە دەست یەکێك لە شێخەکانیان کە ناوی (حوسەین فەزلوڵلا) یە،


حوسەین فەزلوڵلا

لەکاتێکدا باڵی سەربازی شیعی ناسراو بەبزوتنەوی ئەمەل کەوتە ناو قەیرانەوە، چونکە ئەندامەکانی دابەشبوون بۆ دوو گروپ..

هەرچی گروپی یەکەمە بریتیە لە گروپی شیعەی عەلمانی، کە گەرەکیەتی بەبێ گەڕانەوە بۆ بنەماکانی مەزهەبی شیعەی دوازدە ئیمامی یارییەکە بکات و، ناشیەوێت کە پەیوەندی بە مەرجەعە دینیەکانی دەرەوەی لوبنانیشەوە بێت، نەبی بەری سەرکردەی بەناوبانگی لوبنانی ڕێبەرایەتی ئەم گروپەی دەکات. بەڵام هەرچی گروپی دووەمە دەیەوێت درێژەپێدەری ڕێبازی موسای صەدر بێت و، ببێتە دامەزرێنەری حوکومەتێکی شیعە مەزهەب و، بە زەبری چەکیش بێت، داکۆکی کارێکی باشی بیروباوەری لارولەوێری شیعە بێت و، و بەشێوەیەکی بەرفراونیش، باڵێش بکێشێت بەسەر زۆرترین شوێن و، هەماهەنگیەکی باشی لەگەڵ ئەو سەرکردایەتی شۆڕشیش هەبوو کە خەریکی ئەنجامدانی کودەتابوو لە ئێران، بەڵام ئەم گروپە پێویستی بە سەرکردیەك هەبوو کە پێشەوایەتی بکات.

## موسەوی و نەسروڵڵا و پیلانی ئێرانی

لەم کات و ساتە ناسکەدا دوو کەسایەتی شیعە مەزهەب لەشاری نەجەفی عیراقیدا گەڕانەوە، ئەم دوانە لە شاری نەجەفدا بیروباوەڕی شیعەیان دەخوێند، زۆرترین کاریگەریان هەبوو لە پاراستنی هەنگاوەکانی موسای صەدری شیعەمەزهەبی ئاینی، ئەوانیش بریتیبوون لە: عەبباس موسەوی و حەسەن نەسروڵڵا.

ئەو دوو کەسایەتیەش زۆر بەخێرایی چوونە ناو ریزەکانی ئەمەلەوە و دەستیانگرت بەسەر چەند مەڵبەندێکی سەرکردایەتی ناویدا، لەگەڵ ئەوەش دا لەو کاتەدا، حەسەن نەسرولڵا تەمەنی تەنها هەژدە ساڵ بوو.

لەساڵی ١٩٧٩ی زاینیدا شۆرشی ئێرانی ڕوویدا و، شای ئێران لەسەرکار لادرا و، خومەینی لەپاریسەوە گەڕایەوە (دوای ئەوەی وڵاتی عێراق لەساڵی ١٩٧٨ی زاینیدا دەریکردبوو) بۆ شاری تەهران و سەرۆکایەتی گرتەدەست و، دەستی کرد بە ڕێکخستنی باردۆخەکە لەوێوە، خۆی لە نەیارەکانی رزگارکرد و، خۆیشی لە بەرامبەر ئەو کەسانەی کە یارمەتیشیان دابوو لەنێو لایەنەکانی تری ئێرانیدا لە گێلی دا و، بەتەواوی پێگەی خۆی بەهێز و ڕاگیر کرد و، بەپێچەوانەی ئەوەی کە خەڵك چاوەڕێ دەکرد، ڕوشی لە شاری قومی پیرۆزیش نەکرد و، هەر لە تەهرانی پایتەخت مایەوە.

دوای ئەوەی باردۆخەکە لەئێران دا ئارام بووەوە، خومەینی تەماشایەکی لوبنان و عێراقی کرد، کە لەو کاتەدا ئەم دوو شوێنە ژمارەیەکی زۆری شیعەی لەخۆ دەگرت و، هەروەها ئەو کات بە بەشێکی پلانی شیعی دادەنران بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی زەبەلاح لە ناوچەکەدا.

هەرچی باردۆخی عێراق بوو، ئەوکات زۆر لە قەیران دابوو، صەدام حوسەین بەزەبری ئاسن دەستی بەسەر دەسەڵاتدا گرتبوو، خومەینی خۆشی ئەمەی چەشتبوو، چوارده ساڵی تەواو لە عێراقدا ژیا، ئەمەش دەرچوونی ناچاری بۆ پاریس کۆتایی هات. سەرەڕای ئەمەش، خومەینی دەشیزانی ڕێکخستنی شیعە لەناوەوەی عێراقدا

توانای ئەوەی نەبوو کە حوکومەتی صەدام حوسێن لەناوببات، بۆیە خومەینی چارەسەری سەربازی هەڵبژارد و، دەست بەجێ لە ساڵی ١٩٨٠ی زاینیدا جەنگێکی بەرفراوانی لەدژی عێراق راگەیاند- کەمتر لەساڵێك دوای شۆڕشی ئێرانی، ئەمەش بەمەبەستی روخاندنی حوکمەتی عێراقی و دانانی دەست بەشیعەکانی عێڕاق بوو، دواتریش هێنانی عێراق بوو بۆ پاڵ دەوڵە گەورەکەی شیعەکان، کە خومەینی خەونی پێوە دەبینی.

بەڵام هەرچی لە لوبنانی دوور دەستی فرەلایەنی ئاینی بوو، هێشتا خۆپرچەککردن هەبوو کە پێویستی بەکەسانێ هەبوو کە وەلائی تەواویان بۆ خومەینی و رژێمەکەی هەبوو، پاشان خومەینی پەیوەندی کرد بەو دوو پیاوەی کە هەڵگری فیکری شیعەی دوازدەئیمامی بوون، ئەو دووانەی کە بڕوایان بە بنەمای فەرمانڕەوایەتی شەرعزان (ویلایە الفقیە) هەبوو، ئەو بنەمایایەی خومەینی گەیاندە دەسەڵات، ئەوانیش: عەبباسی موسەوی و حەسەن نەسروڵڵا بوون. لێرەوە کۆمەکی و هاریکاری ئێرانی بۆ ئەو دووانە دەستیپێکرد، بەڵام هێشتا سەرکردایەتی ئەمەل هەر بەدەستی نەبیە بەری خاوەن بیری عەلمانییەوە بوو.

لە ساڵی ١٩٨١ی زاینیدا کۆنگرەی چارەمی بزوتنەوەی ئەمەل، بەمەبەستی دانانی سنورێك بۆ ناکۆکیە ناخۆییەکانی، بەسترا، کە لەم کۆنگرەیەدا هەموو لایەنەکان داکۆکی ئەوەیان دەکردەوە کە دەست بگیردرێت بەسەر باشوری شیعیدا و، کۆنگرە بە بڕیاری مانەوە و بەردەوامی نەبیە بەری وەك سەرۆکی ئەمەل دا، لەکاتێکدا عەباس

موسەویشی وەکو جێگری نەبیە بەری دانا، ئەمەش خۆی لەخۆیدا هەنگاوێکی گرنگ بوو بۆ دەستبەسەرداگرتنی باشووری لوبنان.

## داگیرکاری زایۆنیەکان و هەڵوێستی شیعەکان

بەڵام لە ساڵی ١٩٨٢ی زاینیدا، بە دیاریکراوی لە مانگی حوزەرانی ئەم ساڵەدا، شتێك روویدا کە پێکهاتەی هەموو لایەکی گۆڕی؛ کاتێك هەموو لایەك تووشی شۆك بوون بە هۆی داگیرکردنی تەواوی باشووری لوبنان لە لایەن زایۆنیەکانەوە، تەنانەت گەیشتنە بەیروت و دەوریاندا، بەمەبەستی دەرپەڕاندنی یاسر عەرەفات و سەرکردەکانی فەتح و مێلیشیا چەکدارە فەڵەستینیەکان بۆ دەرەوەی لوبنان، رێکەوتننامەی نێوان هێزەکانی زایۆنی و دیانە موارینەکان ڕوون ئاشکرا بوو لە سەر دەرکردنی فەڵەستینیەکان کە خەریك بوو هێزێکی کاریگەریان لەناو کۆمەڵگەی لوبنانییدا پێکدەهێنا، قەسابخانەی زۆر بەسەر فەڵەستینەکاندا هات، لە گرنگترینیان قەسابخانەی سارا و شاتیلا بوو، کە سێ هەزار فەڵەستینی تێیدا کوژران و، زایۆنیەکانیش - بە هاوریکاری لەگەڵ دیانە مەوارینەکان - سەرکەوتوو بوون لە دەرکردنی زۆربەی فەڵەستینیەکان لە باشووری لوبنان و بەیروتیشدا.

ئەم هەڵوێستەش بە گوێرەی هەوا و هەوەسی شیعەکان بوو، چونکە لەمێژبوو داوای ئەمەیان دەکرد کەفەڵەستینیەکان لەباشوردا وەدەربنرێن، ئەمەش وەکو دەستپێکێك بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی خۆیان لەم ناوچەیەدا، بەڵام قەوارەیی زایۆنی نەگەڕایەوە بۆ شوێنی خۆیان پاش دەرپەڕاندنی فەلەستینیەکان، بەڵکو بە ڕەگوریشەی داگوتراویەوە

لەسەر لوبناندا مایەوە و هەڵسا بە داگیرکاری سەربازی تەواوی باشوری لوبنان.

ئەم کردارەش بوو بە مایەی تێکشکاندنی هیوا و ئاواتی شیعەکان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتیان، بەتایبەت چونکە شیعەکان لەناو خۆیاندا بەسەر دوو چیندا دابەش بووبوون: چینی عەلمانی و چینی دینی، دیندارەکانیان بڕیاریاندا کە لە بزوتنەوەی ئەمەل جیاببنەوە و پەیوەندی بکە بە سەرکردە ئێرانیەکان بەمەبەستی وەرگرتنی کۆمەکی لێیانەوە، بەم شێوەیە لیژنەیەکی نۆ کەسیان پێکهێنا کە چوون بۆ ئێران و لە وێدا چاویان بە خومەینی کەوت و ئیعلانی بڕوابوونی خۆیان بە بنەمای ویلایەت و فەقیە بۆ خومەینی کرد و دواتریش خومەینی دەبێتە ئەو کەسەی کە دەبێتە فەرمانڕەوای کاروباری شیعەکان لە لوبناندا، خومەینی دانینا بەم کۆمەڵەیە، پاشان ئەمانە گەڕانەوە بۆ لوبنان تاوەکو بە فیعلی جیابوونەوەی خۆیان لەم بزوتنەوەیە ڕابگەیێنن، دواتر هەڵسان بە پێکهێنانی بزوتنەوەیەکی تر کەلەم کاتەدا بە بزوتنەوی ئەمەلی ئیسلامی (حركة أمل الاسلامية) ناسرابوو، ئەمەش بەسەرکردایەتی عەبباس موسەوی بوو.

لەڕاستیدا ئێران بە هێز بەشداری لەم قەوارە تازەیە کرد، تەنانەت ١٥٠٠ گاردی شۆرشی ئێرانی لە ڕێگەی سوریاوە ڕەوانەی لوبنان کرد، ئەمەش بەمەبەستی مەشقپێکردنی بزوتنەوی ئەمەلی ئیسلامی بوو لەسەر چەك، و کۆمەکیکردنی بەوەی پێویستی بوو لەرووی دارایی و سەربازیەوە. بەم شێوەیە ئەم بزوتنەوە تازەلەدایك بووە پاڵپشتی دوو دەوڵەتی گەورەی وەکو ئێران و سوریای بەدەستهێنا، لەهەمانکاتدا سوریا هێشتا یارمەتی بزوتنەوی ئەمەلی قەومیشی هەردەدا.

## دامەزراندنی حیزبوڵلا و کۆنترۆڵکردنی باشوری لوبنان

شەڕی ناوخۆیی لوبنانی هەربەردەوام بوو، هێزی بزوتنەوی ئەمەلی شیعی ئیسلامی هەر لە گەشەسەندندابوو، تا ئەو کاتەی عەباس موسەوی لە شوباتی ١٩٨٥ ی زایندا بزوتنەوی حیزبولڵای ئیسلامی لە شوێنی بزوتنەوی ئەمەلی ئیسلامیدا ڕاگەیاندا، دوابە دوای ئەمەش بە سێ مانگ، لە مانگی نایاری ١٩٨٥ی زایندا، بزوتنەوەی ئەمەل هەڵسا بە ئەنجامدانی قەسابخانەك لەدژی فەلەستینیەکان، کە سەدان قوربانی لێکەوتەوە، ئەمەش بۆ ئەوە بوو تاکو پاشماوەی فەلەستینیەکان لە باشور لوبنان دا بنەبڕبکات.

لەڕاستیدا، بزوتنەوی ئەمەل خەریکی کێبرکێ بوو لەگەڵ حیزبووڵلا دا لەسەر سەرکردایەتی لەو ناوچانەی کە شیعەکانی تێدا کۆ ببوونەوە لە باشوری لوبنان و پارێزگای بیقاعدا، لەمەوە ململانێ لەنێوانیاندا دەستی پێکرد، ئەمەش بە شەڕێکی گەورە کۆتایی هات، کە بەهۆیەوە حیزبووڵلا بزوتنەوەی ئەملی لە ساڵی ١٩٨٨ی زاینیدا لە ڕەگ و ریشەوە دەرهێنا، و




٩٠٪ ی ئەندامەکانی ئەم بزوتنەوەیە بوون بە ئەندامی حیزبووڵلا لە ژێر سەرکردایەتی ئێرانیدا، ئەمەش بە هۆی سیستەمی ویلایەتی

فەقیە وپاڵپشتی هێزی سوری بوو. بەهۆی ئەمەوە بزوتنەوەی ئەمەل سیستەمی سەربازی چووە دەرەوەو تەنها وەك بزوتنەوەیەكی سیاسی لە گۆڕەپانەكەدا مایەوە.

لەگەڵ ئەمەدا، گۆڕەپانکە بۆ حیزبوولڵا چۆڵ بوو، تەنها ئەوە نەبێت کە حیزبوولڵا هەستی کرد کە مەڵبەندی هێزی بریتی بوو لە باشوری لوبنان، کە تا ئەو کاتەش لە لایەن زایۆنیەکانەوە داگیر کرابوو، ئەمەش وایلێکرد کە هەوڵی کۆنترۆلکردنی هەندێ لە گەڕەکەکانی



بەیروت بدات، تاوەکو بیکاتە مەڵبەندێك و لەوێوە تەشەنە بکات، حیزبوولڵا بەرەو بەیروتی ڕۆژهەڵات نەچوو کە شوێنی نیشتەجێبوون گاورەکان بوو، بەڵکو ڕوویان کردە بەیروتی ڕۆژ ئاوا بەتایبەت باشورەکەی، زۆربەی ئاوچەکانیان بە زەبری هێز داگیرکرد، کەتەواوی ئەو ناوچانە ناوچەی سوننە نشین بوون، هەندێ جار خانوویان لەسەر موڵکی گشتی و هەندێجاریش لەسەر موڵکی سوننەکاندا دروست دەکرد، حکومەتی لوبنانی لە ئاست ئەم کردارەی حیزبووڵلا دا بێ دەنگ بوو، هەتا وایلێهات تەواوی دەوروبەری باشوری بەیروت بوو بە شیعە و حیزبوڵلا بەتەواوی کۆنتڕۆڵی کرد.

لە ساڵی ١٩٨٩ی زاینیدا خومەینی کۆچی دوایی کرد، و عەلی خامەنەئی لە پۆستی رابەری شۆرش شوێنی گرتەوە، باردۆخەکەش

سەبارەت بە حیزبوڵڵا وە هیچ گۆڕانکاری بەسەردا نەهات؛ چونکە هێشتا سەربە پێشەوای شەرعزان (الولی الفقیه) عەلی خامەنەئی بوون. لەهەمان ساڵدا، لایەنە ناکۆکەکانی لوبنان بەناوپڕی سعودیە لە تائیف کۆبوونەوە و ڕێککەوتنامەی تائیفیان واژۆکرد، کەکۆتایی بە شەڕی ناوخۆی لوبنان هێنا. هەر لەوساڵەشدا گەورە کەسایەتی سوننەکان کە شێخ حەسەن خالید (ڕەحمەتی خوای لێبێت) کە موفتی لوبنان، تیرۆرکرا، کە لە ساڵی ١٩٦٦ی زاینیەوە موفتی لوبنان بوو، تاوەکو موسلمانە سوننەکان پیشەوایەتی خۆیان لەدەست بدەن لە کاتێکدا حیزبووڵلا وەکو سمبولێکی ئیسلامی لە وڵاتی لوبناندا دەرکەوتبوو.

## دژایەتی جولەکەکان و نکۆڵیکردنی سوننەکان

حیزبوڵڵا دەستیکرد بە خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگی جولەکەکان، تاوەکو ئەو ناوچانەی سەر بەدەسەڵاتی خۆی بوون ڕزگاریان بکات کە بە نیاز بوو دەوڵەتێکی شیعی لە سەردا دامەزرێنێ، بۆ ئەم مەبەستە، سەرەڕای کۆمەکیەکانی سوریا، ماڵ و سامانێکی بەرفراوانی لە ئێرانیشەوە بۆ هات، ئەمەش جولەکەکانی نیگەرانکرد، بۆیە لەساڵی عەبباس موسەوی ئەمینداری حیزبوڵڵایان تیرۆرکرد، ئینجا حەسەن نەسروڵڵا بوو بە سەرۆکی ئەم حیزبە.

لە هەمان ساڵدا، سمبولێکی تازەی سوننەکان دەرکەت و سوننەکانی لوبنان بەدەوری دا کۆبوونەوە، کە ئەویشی بریتی بوو لە ڕەفیق حەریری، کە لە ساڵانی ١٩٩٢ تا ١٩٩٦ی زاینیدا سەرۆك وەزیرانی لوبنان بوو، ئەو سەرلەنوێ دەستی بە بونیادنانەوەی لوبنان کردەوە، و

ژمارەیەکی زۆر لەلوبنانیەکان لەدەورەی کۆبوونەوە.

لە ساڵی ١٩٩٦ی زاینیدا جولەکەکان هەڵسان بە ئەنجامدانی دوژمنداریەکی وەحشیگەرانە بەسەر لوبنان دا، لە ئەنجامی کرداری شاڵاوی تورەیی، گوروتین بۆ رزگاربوون لەداگیرکاری جولەکان لە دڵی لوبنانیەکاندا دەستی بە جولە کرد، بۆیە حیزبوڵلا پێکهێنانی سریە لوبنانیەکانی ڕاگەیاند بۆ بەرگریکردنی جولەکەی دوژمن،بۆیە چین و توێژە جیا جیاکانی گەلی لوبنانی پەیوەندیان بە بەم سریانەوە کرد، زوربەی ئەندامانی ئەم سریانە لە ئەهلی سوننە بوون، کە ٣٨٪ ی سوننە و، لەکاتێکدا شیعەکان ٢٥٪ داو، سەرەڕای ٢٠٪ یان لە دەروزیەکان، و ١٧٪ یان گاور بوون.

ئەم هێرشانەی کە ئەم سریانە ئەنجامیاندا، بوو بە هۆی ناچارکردنی هێزە زایۆنیەکان بەکشاندنەوەیان لە زۆربەی ناوچەکانی باشوری لوبنان لە ساڵی ٢٠٠٠ی زاینیدا، جگە لە کێڵگەکانی شەعبا نەبێ، حیزبوڵلا هەڵسا بە داگیرکردنی تەواوی ئەم ناوچانە، و رەتیکردەوە کە سوپای لوبنانی لەم ناوچانەدا هێزەکانی بڵاوبکاتەوە، حیزبوڵلا نکۆڵی لەو هەوڵ و کۆششە هاوبەشیەی لوبنانیەکان کرد کە بەشداربوون لە ئازاد کردنی لوبنان، تەنانەت دەستی کرد بەداگیرکردنی موڵك و ماڵی سونەکان لە باشورلوبنان و چیای لوبنان دا، تەنانەت کارگەیشتە ئەوەی کە هەڵبکوتنە سەر مزگەوتی نەبی یونس و ئەوقافی ئەم شوێنە، کە سەر بەهەرێمی جیە (الجیة) بوو.

## ڕەفیق حەریری و هەڵکشانی شیعەکان



هەر لەم ساڵەوەی زایۆنیەکان لە لوبناندا چوونە دەرەو، ڕەفیق حەریری سەرلەنوێ پۆستی سەرۆك وەزیرانی لوبنانی وەرگرتەوە، بەڵام ئەو جارەیان خۆی و خانەوادەکەی بە شێوەیەکی نوێ دەرکەوتن، بوو بە یەکێ لە سمبولە بەناوبانگەکانی سوننەکان کە سمبولی کێبڕکێەکی بەهێزی هەڵکشانی شیعەکان بوو لە لوبنان دا.

هێزی حیزبوڵلا لەگەشە سەندنیدا بەردەوام بوو، کە دەیویست هەلێك بدۆزێتەوە بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی شیعی بە پاڵپشتی ئێران و سوریا، بەڵام دەرکەوتنی ئەستێرەی ڕەفیق حەریری بارودۆخەکەی بە شێوەیەکی هاوسەنگ لەلای گەلی لوبنانیدا هێشتەوە.

لە ساڵی ٢٠٠٤ی زاینیدا رەفیق حەریری، لەبەر ناکۆکی لەگەڵ ئەو سوریانەی کە لە ڕیزی سوپادا بەچڕی بوونیان هەبوو لە لوبناندا، وازی لە پۆستی سەرۆك وەزیران، دواتر شتێکی چاوەڕوان نەکراو ڕوویدا لە مانگی شوباتی ٢٠٠٥ ی زاینیدا ڕەفیق حەریری کە لەناو کەژاوەی ئۆتۆمبیلەکانی لە ناو شاری بەیروتدا تیرۆرکرا، لەکاتێکدا

ژمارەیەکی زۆر لە هەواڵگرانی جیهانی لە گۆڕەپانی لوبناندا کاریان دەکرد، لەوانە هەواڵگری ئەمریکی و فەرەنسی و سوری ئێرانی لوبنانی، بەمەش سوننەکان یەکێك لە سمبولە ناوازەکانیان لەدەستدا.

دوابەدوای تیرۆرکردنی ڕەفیق حەریری لوبنان هاتە هەژان و پەنجەی تۆمەتی نێودەوڵەتی بەرەو سوریا درێژکرا، دواتر کۆمەڵگەی نێودەوڵتی داوای لە سوریاکرد کە هێزەکانی لە لوبنان بکێشێتەوە، حیزبوڵلا هەڵسا بە ئەنجامدانی ڕێپێوانێکی گەورە لە ٨ی ئازاری ٢٠٠٥ی زاینیدا بۆ پاڵپشتیکردنی لە مانەوەی هێزەکانی سوریا و دەرنەچوونیان، بەڵام ئەمە لەلایەن بەرەی موستەقبەل ڕەتکرایەوە، کەبریتی بوو لە بەرەی بنەماڵەی ڕەفیق حەریری بەسەرکردایەتی سەعد حەریری، کەلەلایەن کوتلەی لیقای دیموکراتییەوە بە سەرکردایەتی دورزی وەلید جونبلانت، و حیزبی هێزە لوبنانیە مارونیەکان بەسەرکردایەتی سەمیر جەعجەع ەوە بە خۆپیشاندانێکی گەورە لە ١٤ی ئازاری ٢٠٠٥ ی زاینیدا کەداوای دەرچوونی سوریایان دەکرد لە لوبناندا پاڵشتی دەکران، بۆیە ئەم گردبوونەوەیە بە گردبوونەوی ١٤ی ئازار ناسرا، و بەشێوەیەکی کردارەکی سوریا لەهەمان مانگدا لە لوبناندا کشایەوە.

## قەیرانی حیزبوڵڵا و جەنگی ٢٠٠٦

حیزبوڵلا زانی کە دوای دەرچوونی سوریا لە لوبناندا توشی قەیران دەبێتەوە، بەتایبەت دوای بەرزبوونەوەی نەعرەتەیەکی نەتەوەیی بەهێز بەتایبەت دوای تیرۆرکردنی حەریری، دواتر حیزبوڵلا بە چاکی زانی کە لەگەڵ هیزەکانی تردا بەشداری کایەی سیاسی بکات و چووە ناو



هەڵبژاردنە پەرلەمانیەکانی لوبنانی لە مانگی ٢٠٠٥ی زاینیدا، بەهاوپەیمانی لەگەڵ سێ بەرەی تردا، ئەوانیش: بەرەی موستەقبەلی سوننی و بەرەی جەنبیلاتی دورزی- سەرەڕای دوژمنداری لەگەڵ ئەم دوو بەریە- هەروەها لەگەڵ بزوتنەوی ئەمەلی سیاسی، ئەم هاوپەیمانیەش بە هاوپەیمانی چوارقۆڵی ناسرا، کە بەیەکەوە ٧٢ کورسی پەرلەمانیان لە کۆی ١٢٨ کورسیدا بەدەستهێنا، بەمەش زۆرینەیان پێکهێنا، و حکومەتێکیان بە سەرۆکایەتی فوئاد سەنیورە پێکهێنا.

لە ڕاستیدا حیزبوڵلا زۆری لەخۆی کرد، و لەگەڵ سوننەکاندا، سەرەڕای ناکۆکی لەگەڵیاندا، بەشداری ئەم حکومەتەی کرد، تاوەکو خۆی بەشێوەیەك نیشانبدا کە گوایە هاوبەشی نیشتیمانییە، لەگەڵ ئەوەشدا حەسەن نەسرۆڵلا ئامادەی هیچ یەك لە کۆبوونەوە و کۆنگرە گشتیەکان نەدەبوو، بەلکو تەنها نوێنەرێکی دەنارد، و مامەڵەی

لەگەڵ هەموولایەکاندا بەشێوەیەك بوو کەخۆی بەگەورەتر لەوان دەگرت، ئەمەش وەك دەروازەیەك بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی لە سەروی هەموویانەوە.

لەوانەش گەورەترین بەڵگەی ئەم دیدگەیەش بریتیبێ لە چوونە پێشەوەکەی حیزبوڵلابێت لە بەرواری ١٢ ی تەمموزی ساڵی ٢٠٠٦ی زاینیدا بە ئەنجامدانی کردەوەیەکی سەربازی لە دژی زایۆنیەکان، کە تێیدا دوو سەربازی زایۆنیەکانیان دەستبەسەر کرد و هەشتیشیانیان لێ کوشتن، ئەمەش بەبێ ئەوەی لەدورو نزیك بگەڕێنەوە بۆ لای حکومەتی لوبنانی، کە خۆیان بەشداربوون تێیدا، تەنانەت نەگەڕانەوە بۆ لای ئەو هاوپەیمانانەشیان کە بەهۆی ئەوانەوە گەیشتبوون بە پەرلەمان، ئەم کردەوە سەربازیەش بوو بەهۆیەکی سەرەکی لە پەلکێش کردنی تەواوی دەوڵەتی لوبنانی نەك تەنها حیزبوڵڵا بۆ جەنگی قەوارەی زایۆنی.

جەنگە بەناوبانگەکەی تەموزی ٢٠٠٦ی زاینی هەڵگیرسا، کە تۆپبارانکردنی لوبنان لەلایەن قەوارەی زایۆنی ٣٣ رۆژی تەواو بەردەوام بوو، ئامانجی زایۆنیەکان بریتی بوو لە وێرانکردنی ژێرخانی حیزبوڵڵا و لوبنان، بۆیە حیزبوڵڵا بە تێگردنەوەی موشەك وەڵامی زایۆنیەکانی دایەوە، بەڵام ژمارەیەکی زۆر لە لوبنانیەکان کوژران، لەکاتێکدا جولەکە نەیتوانی موشەکەکانی حیزبوڵڵا بوەستێنێ، ئەمەش بە سەرکەوتنێکی گەورە بۆ حیزبوڵڵا دانرا، جولەکەکان تۆپبارانەکانیان ڕاگرت بێ ئەوی هێزی موشەکی حیزبوڵڵا لەناوبەرن، هەروەها بێ ئەوەی دوو سەربازە ڕفێندراوەکەشیان بهێننەوە.

جەنگە وێرانکەرەکە کۆتایی پێهات و کۆمەڵگەی لوبنانی توشی بارودۆخێکی ناخۆشی کاولکاری یەکی ئەو تۆ بووەوە کە هەموو بەشەکانی وولاتەکەی گرتەوە، هەروەها ڕوبەڕوی هەڵکشانێکی



جەنگی لوبنان ٢٠٠٦

شیعەگەرایی زۆر بووەوە، کە تاوەکو ئێستاشی لەگەڵدابێ، چەکی ئێرانی پیشکەوتووی هەرماوە، بەهاوکارییە بەرفراوانەکەی سوریا، ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە هەموو لایەك هەست بکەن کە وولاتی لوبنان ڕووەو سەرکردایەتیەکی شیعی هەنگاو دەنێ، بەتایبەت لەگەڵ بارودۆخی جولاندنی هەست و سۆزی جیهانی ئیسلامی بۆ حیزبوڵڵا بەهۆی جەنگانی لە دژی جولەکە.

دوای ئەمە لە لوبنان چی ڕوودەدات؟

ئەم هەنگاوانە چین کە پرۆژەی شیعەکانی پێیدا تێپەڕی؟

حەسەن نەسڕوڵڵا چۆن ڕای خۆی سەبارەت بە داهاتووی لوبنان دەربڕی؟

بۆ حیزبوڵڵا لە هەڵبژاردنە پەرلەمانیەکەی حوزەیرانی ٢٠٠٩ی زاینیدا دۆڕا، سەرەڕای گەشەسەندنی هێزەکەی؟

چ هەڵوێستێك پێویستە لەسەر کۆمەڵگەی ئیسلامی لەم کاتەدا؟

# چیرۆکی حیزبوڵڵا ٣-٣

لە دوو بەشی ڕابردوودا، چیرۆکی حیزبوڵڵا ١-٣ و چیرۆکی حیزبوڵڵا ٢-٣ باس دروستبوونی حیزبوڵڵا و دروستکەرەکەی و پەیوەندیە سەرەکیەکەی بە ئێران و سوریا، هەروەها باسی پلانی ئەم حیزبەشمان کرد بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی شیعی لە لوبنادا، لە کۆتایشدا باسی شەڕی ساڵی ٢٠٠٦زاینمان کرد، کەتێیدا قەوارەی زایۆنی شکستی خوارد لە لەناوبردنی هێزی حیزبوڵڵا، هەروەها شکستیشی خوارد لەوەی کە سەرکردەکانی ئەم حیزبەش بکاتە ئامانجی، ئەمەش هەستێکی دڵخۆشکەری لە شەقامی ئیسلامی جێهێشت، و بووە هۆی گەشانەوەی ڕۆڵەکان ئوممەی ئیسلامی، بەتایبەت لەبەرئەوەی چونکە موسلمانان لە ساڵی ١٩٧٣ زاینیەوە بەدواوە سەرکەوتنیان بەرامبەر زایۆنیەکان بەخۆوە نەبینیبوو، کە ئەمەش دەکاتە زیاتر لە سی ساڵ، دەربرین و عیبارەی مەدح و سەنای حیزبوڵڵا و سەرکردەکەی (حەسەن نەسروڵڵا ) لە نێوان خەڵکیدا دەنگی دەدایەوە، تا ئەو ئاستەی کە هەندێ پێشبینی ئەوەیان دەکرد کە حەسەن نەسروڵڵا ببێتە پێشڕەوەی تێکڕای ئوممەی ئیسلامی، لەکاتێکدا پێشینەکەی

حەسەن نەسرولڵلایان لەیاد چووبووەوە کە شیعەیەکی ١٢ ئیمامی یە، کە وای لێدەکات بەردەوام دژایەتی ئەهلی سوننە بکات، جا ئەمە چ بەئاشکرایی بێ چ بە نهێنی.

## حسن نەسرولڵا و کودەتا لە دژی حکومەت

حیزبوڵڵا لە جەنگی ٢٠٠٦ ی زایندا دەرچوو و دەیویست بەرووبوومی ئەم ڕووداوە گەورەیە دروێنە بکات، بۆیە دەستبەجێ کودەتای لەسەر ئەو حکومەتە کرد کە خۆی بەشێك بوو لەو حکومەتدا، بۆ ئەم مەبەستە لە ٣٠ کانونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٦ ی زاینیدا هەڵسا بە ئەنجامدانی گردبوونەویەك لەچواردەورەی بارەگەی حکومەت و زیاتر لە ٦٠٠ خیوەتی تیدا هەڵداو ئەمەش بە مەبەستی درێژەدان بە



حیزبوڵڵا کۆنترۆڵی بەیروت دەکات

گرتبوونەوەکە بوو، داواکاریشیان بریتی بوو لەوەی کە دەبێ سەرۆکە سوننیەکەی کە ناوی فوئاد سونیوری بوو دەست لەکاربکێشێتەوە. ئەمەش لەکاتیکدا پێچەوانەی دەستوری لوبنانی بوو کە دەبووایە لە دوای ئەم سەرۆکەش هەر سوننیەکی تر جێگەی ئەمەش بگرێتەوە، ئەم نیازەی حیزبوڵڵا ئاماژەیەك بوو بۆ توانا داری ئەم حیزبە بۆ گۆرینی کاروبارەکان بەو شێوەیەی کە خۆی دەیەوێ، ئەوەی کە لە دوای ئەمە دێ دەبێت گوێڕایەڵی سەرکردەی چاوەڕوانکراوی لوبنان بێت، کە خۆی لە حەسەن نەسرولڵا دا دەنواند، بۆیە گردبوونەوەکە نزیکەی ١٨ مانگ بەردەوام درێژەی کێشا!!

پاشان باردۆخەکە تەقییەوە کاتێك حیزبوولڵا هەڵسا بە ئەنجامدانی تاوانکاریەکی سەربازی، بە هێزە چەکدارەکانیەوە هاتنە خوارەوە بەمەبەستی گەمارۆدانی تەواوی بەیروتی رۆژئاوا کە سوننەکان تێیدا دەژیان، هەرەشەی چوونە ناوەوە یان لانەدانی گەمارۆیەکەیان دەکرد، ئەم رووداوەش لە بەرواری ٩ مایسی ساڵی ٢٠٠٨ی زاینیدا بوو.

ئــەم کارەش بە کارێـکی هــەوەنتە ئەژمــار نــاکرێت، بــەڵکو تاقیکردنەویەکی کردارەکی بوو لەسەر ئەرزی واقیع، بەمەبەستی جولاندنی میلیشیا چەکداریەکان بوو، تاوەکو بەرەکانی بەیروتی پایەتەخت گەمارۆبدات، بەڵکو ئەمە سەرنجمان ڕادەکێشێ بۆ ئەمەی کە وەلید جەنبیلات ئاشکرای کرد بەشەش ڕۆژ بەر لەم گەمارۆدانە، بە دیاریکراوتر ٣ی مایسی ٢٠٠٨ی زاینیدا بوو، کاتێك وەلید جەنبیلات لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیدا ئاشکرای کرد کە دەستی گرتووەبەسەر نامەی نێوان وەزیری بەرگری لوبنانی ئیلیاس مورِ و

هەواڵگری لوبنانیدا، کە باسیان لە بونی کامیرەی سەر بە حیزبوڵڵا دەکرد لەچواردەورەی فرۆکەخانە دا، لەهەمانکۆنگرەدا وەلید جەنبیلات ئاماژەشی بەمە کرد کە لەو کاتەی کە قەدەغە بوو چەك بهێندرێتە لوبنان، چەك بە لێشاو لەئێرانەوە بۆ حیزبوڵڵا دەهات، ئەمەش تەنها ماوەیەکی سنوردار بوو، ئەم قەوارەیەش دەبێتە تاکە قەوارەی چەکدار، بەڵکو چەکداریەکەی لە چەکداری سوپای لوبنانیش زۆر زیاتر دەبێت.

## رێکەوتننامەی دەوحە و شکستهێنانی نەسروڵلا

ئابلۆقەی سەر بەیروتی ڕۆژئاوا ماوەی ١٣ ڕۆژ بەردەوام بوو، تا رێکەوتننامەی دەوحە مۆرکراو کۆتای بەشەڕەکە هێنا، گرتبوونەوەکە پەرتەی پێکرا، بەڵام لەهەمان کاتدا رێککەوتننامە چوار قۆڵییەکەی نێوان بەرەی موستەقبەلی سوننی و حیزبوڵڵای شیعی و بزوتنەوەی ئەمەلی شیعی و پارتی لیقای دیمکراتی دورزیی کۆتایی پێهات، هەموو لەیەنەکان گەیشتنە ئەو دەرئەنجامەی رێکەتننامەیەکیلەو شێوەیە زۆر زۆر ئەستەمە، و بێگومان، بەرژەوندیەکانی نێوان سوننە و شیعە پێچەوانەیانن.

لێرەوە، دوو لایەنەکە دەستیان بەتۆمەتبارکردنی یەکتری و کێبڕکێ و ململانێ لە دژی یەکتری کر، هەرچی بەرەی موستقەبەل یان کۆمەڵەی ١٤ی ئازار درکی کردبوو کە لە سەر ئەرزی واقیعدا ئەگەری ئەوە هەبوو کە شیعە جڵەوی دەسەڵاتی تەواوی لوبنان بگرێتە دەست، و حیزبوڵڵاش دەستی بە تۆمەتبارکردنی بەرەی موستەقبەل بەوەی بەکرێگیراو و نۆکەری ئەمریکان، ئەمەش بەمەبەستی دابەزاندنی

پلەو پایەیەی بەرەی موستەقبەل لە لایی گەلی لوبنانی و بەرە نەتەوییەکاندا، ئەم جۆرە یەکتری تۆمەتبارکردنانە بەردەوام بوو، و نەگبەتیەکەی ئەمە هەر ڕوو لە زیاد بوون بوو لەگەڵ تێپەڕبوونی کات و تا نزیکبوونەوەی وادەی هەڵبژاردنە پەرلەمانیە تازەکەی حوزەیرانی ساڵی ٢٠٠٩ی زایینی، کەتێیدا کۆمەڵەی ١٤ی ئازار بەسەرکردایەتی سەعد حەریری لەدژی حیزبووڵڵا بەسەرکردایەتی حەسەن نەسرڵڵا چووە ناو هەڵبژاردنەکەوە، والێهات هەر پارتە و دەسەڵات و صەلاحیاتی خۆی پیشان دەدا، لەهەمانکاتدا تانە و تەشەنی لەبەرامبەرەکەی دەدا.

پاشان حەسەن نەسرولڵا کەوتنێکی گەورەی ئەوتۆ کەوت کەناکرێت لە سیاسەتمەدارێکی وەکو ئەودا شتی وا ڕووبدات، مەگەر خودای گەورە و توانا لاپەڕە ڕەشەکانی ئەوی ئاشکرا نەکردبایە. حەسەن نەسروڵڵا لە وتارێکی بەر لە هەڵبژاردن لە بەرواری ٢٩ ی مایسی ٢٠٠٩ی زایینی ڕایگەیاند، ئێستاش دەقی وتارەکە لە ماڵپەڕی حیزبوڵڵا دا لە ئینتەرنێت دا ماوە، کە ئەگەر فراکسۆنەکەی ئەو لە هەڵبژاردنەکەدا دەربچێت ئەوا ئەو چەك لە ئێران و سوریاوە دەهێنێت بۆ ناو لوبنان، بە ئاشکرا شیعەگەرایی بە زمانەکەیەوە دیار بوو، تەنانەت ووتی: "ئەوەی من بزانم، کۆماری ئیسلامی ئێران، بە تایبەت خاوەن شکۆ پێشەوای سەرکردە و گەورەمان خامەنەیی (تەمەن درێژ بێت) بە هیچ شێوەیەك ڕەزیلیان بەرامبەر بە لوبنان نەکردووە."(١)

---

(١) بۆ بینینی ئەم دەقە، سەیری ماڵپەری حیزبوڵڵا بەناو نیشانی (المقاومظ الاسلامیظ فی لوبنان) بکە بە لینکی: www.moqawama.org

ئەو بەو پەڕی روون و ئاشکرایی بەگەلی لوبنانی دەڵێ کە ئەو داراییەیی کە دەسەبەری ئەمن و ئاسایش و شکۆی گەل دەکات لەلایەن لایەنێکی شیعەوە بۆیان دێ، ئەمەش خۆیی لە خۆیدا تۆقاندن و موژدەدانیش بوو لەهەمان کاتدا، هەروەها سەرەنج ڕاکێشانێکیش بوو بۆ لای قەبارەی حیزبوڵڵا و پەیوەندیەکەی لەگەڵ ئێران.

بەم شێوەیە پەیامەکە گەیشتە خەڵکی لوبنانی، بەڵام بە پێچەوانەی ئەو ئاراستەیەی کە حەسەن نەسروڵڵا دەیهەویست، لوبنانیەکان ترسناکی شیعەکانیان بۆ دەرکەوت. درکیان بەوە کرد، کە گەیشتنی حیزبوڵڵا بۆ دەسەڵات واتای زیاتر پرچەککردنی حیزبوڵڵا بوو نەك لوبنان، هەروەها ئەگەری دروستبوونی دەوڵەتێکی هاوپەیمان لەگەڵ ئێران و سوریادا زۆر نزیك بووەوە. لێرەدا گەلی لوبنانی هەستیان بەم ترسناکیە کرد، ئەم ترسەش لە ناو سندوقەکان دەنگداندا بەدیارکەوت، کە دەنگەکانی نزمبووەوە لەبەرژەوندی فراکسۆنی ١٤ی ئازار، لەگەڵ ئەوەی کە سەنگی سەعد حەریری بەقەد سەنگی رەفیق حەریری باوکیشی نەبوو، بەڵام خودی گەلی لوبنانی هەستیان بە ترسناکی بارودۆخەکە کرد.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بە کاریگەری و پەستانی ئەمریکا لەو بارودۆخەدا بکەین کە ئەمەی لێکەوتەوە، چونکە هەڵبژاردنەکە هەڵبژاردنێکی پاك بوو، هیچ لایەنێك تانەی لە ئەنجامە روون و ئاشکراکەی نەدا، بەرەی ١٤ی ئازار بە جیاوازی ١٤ کورسی هەڵبژاردنەکەی بردەوە، ئەم ژمارەیەش ژمارەیەکی گەورە بوو لە هەڵبژاردنەکەی لوبناندا، ئەمەش واتای سەرەتایەك بوو بۆ روون بوونەوەی بارودۆخەکە بەشێوەکی گەورەت.

## هەڵوێستمان بەرامبەر بە حیزبوڵلا

دوا بەدوای ئەم چیرۆکە دورو درێژەم خستە ڕوو حەزدەکەم لەگەڵ خوێنەری بەڕێزدا هەڵوێستەیەك بکەم تاوەکو بیرو ڕای خۆم سەبارەت بەهەندێ بابەت بخەمە ڕوو کە وەڵامی کۆمەڵە پرسیارێکی سەرلێتێکدەر دەداتەوە لە مێشکی زۆرێك لە مسوڵمانانداا دەخولێتەوە کاتێك سەیری ئەم ڕووداوانە دەکات، بێگومان لەوانە هەندێ کەس هاو ڕا بن لەگەڵم بەپێچەوانەش هەندێ کەس تر دژەڕان لەگەڵم دا، بەڵام لێرە دا بەهەمو لایەکی ڕادەگەێنین کاتێك تەعلیق لە سەر شتێك دەدەین دەبێ سۆز و عاتیفەمان وەلانێین، بە مێشك حوکم لەسەر شتەکان بدەین، و کە کاتێك ویستمان شیکردنەوەیەکی باش بکەین، پێویستە لەسەرمان لە ڕەگ و ریشەی بابەتەکان بکۆڵینەوە و بۆ مێژووی کۆن و نوێ بگەڕێنەوە، و ڕووداوەکان بە یەکەوە ببەستینەوە و خوێندنەوە بۆ ئەو دیویان بکەین، لە ئامانج و پاشینەی مێژووی و بیروباوەڕی هەر کۆمەلێك بکۆڵینەوە، ئەو کاتە زۆرێك لە تێڕوانینەکانمان دەگۆڕێت بەرامبەر بەم کۆمەڵەیە، ئەو کات دەبین بە بەرگریکاری لەوەی کە هێرشمان دەکردە سەرەی یاخود دەبین بە هێرشکار بەرامبەر بەوەی کە بەرگریمان لێیدەکرد.

**یەکەم:**

دامەزراندنی دەوڵەتێکی شیعی لە لەلوبناندا کارێکی چاوەڕوانکراوە، تەنانەت ئەگەرێکی زۆر نزیکیشە، توانستەکەی حیزبوڵلا توانستی

خیزبێك یان گروپێك نیە بەڵكو توانست و هێزی دەوڵەتێكە، هەروەها پاڵپشتیكردنی ئێران و سوریاشە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێكی شیعی هاوپەیمان لەگەڵیاندا پاڵپشتیكردنێكی زەبەللاحە، ئەم حكومەتەش باشوری لوبنان دەگرێتەوە، سەرەڕای هەرێمی باكووری ڕۆژهەڵاتی لوبنان، درێژدەبێتەوە تاوەكو تەواوی بەشی باكووری لوبنانی سوننی نشینیش دەگرێتە خۆی!

بەهەمان شێوە، لەوانەیە دەستبگرێ بەسەر بەیروتی ڕۆژئاوا باشووریشدا، هەرچی هەرێمەكانی دیانە(مەسیحیە)كانە ئەوا ناوچە ناكۆی لەسەرەكانە، بەدووریشی نازانین كە حیزبوولا قایل بێ بە دامەزراندنی دوو دەوڵەت لەسەر خاكی لوبناندا؛ دەوڵەتێكی شیعی و دەوڵەتێكی مەسیحی، سەیر نیە چونكە پێشی هەزار ساڵ شیعە ئیسماعیلیەكان پێشنیاری ئەویان بۆ خاچپەرستەكان كرد كاتێك كە هاتنە ناو خاكی شام كە خاكی سوننەكان لەنێوان خۆیاندا دابەشبكەن؛ بەو پێیە خاچپەرستەكان سوریا و لوبنان، و شیعەكانیش فەلەستین و ئوردون بۆ خۆیان ببەن، بەلام دوای خاچپەرستەكان ئەمەیان ڕەتكردەوە چونكە دەیانویست تەواوی وڵاتی شام بۆ خۆیان داگیربكەن.

بەنسبەت سوننەكانەوە، دامەزراندنی دەوڵەتێكی شیعی لە لوبناندا كارێكی ئاوەها هەوەنتەو ئاسان نییە، چاوێك بە مێژوو سەرگوزشتەی ئێران، هەروەها ئێراق و هەروەها هەڵوێستی حیزبی ئەمەل و دواتر حیزبوللا و دابخشێنەوەو لەگەڵ سوننەكان لە لەلوبناندا، هەروابێتەوە، چاوێكیش بخشێننەوە بە مێژووی دەوڵەتی بوەیهیەكان و دەوڵەتی حەمدانیەكان و دەوڵەتی عوبەیدەكان (كە بە ساختە بە ناوی دەوڵەتی

فاتیمیەکان ناسرا بوو) و سۆفیەکان.. مێژووی ئەمانە بخوێنەوە تاوەکو بزانن کە دامەزراندنی دەوڵەتێکی شیعی بەهێز واتا زاڵبوون بەسەر سونەکان بە پلە یەکەم، قەزیەکە قەزیەی بیروباوەڕە، ڕاستەیەکانیش گەوهای ئەمە دەدەن.

## شەڕی بەرژەوەندیەکان

**دووەم:**

شەڕو چەنگی حیزبوللا لەگەڵ جولەکەکان شەڕی بەرژەوەندیەکانە، نەوەکو شەڕی بیروباوەڕ. جولەکان لەساڵی ١٩٨٢ی زاینیدا هاتنە ناو باشووری لوبنان، کە بریتیە لەو ناوچەیەی کە دەبوو دەوڵەتە شیعیە چاوەڕوانکراوەکەی لەسەر دابمەزرابایە، بۆیە هەردەبوو کە بەرگری بکەن لەپێناوی مانەوەی خۆیان، وەکو هەشەڕێکی تر کەلە نێوان دوو لایەنی دونیاییدا ڕوودەدات، ئەم شەڕ و جەنگانە بۆ ئەوە نەبوو تاوەکو ووتەی خودای گەورە بەرزو بڵند بێ، چونکە ئەو ووتەیە خواییەی کە شیعەکان دەیانەوێ بەرزو بڵند بێ ووشەیێکی لارولەوێرو دەستکاریکراوی پوچەڵە، کە تێیدا بانگهێشەی بیگوناهی و مەعصومیەتی پێشەواکانیان دەکەن، و پلەوپایەی ئەم پێشەوایانەیان لە پلەوپایەی پێغەمبەرانیش بەرزتر کردۆتەوە، ئینجا چ بەرژەوەندی وخێروبێرێ لە دواوەی ئەمە داهەیە؟؟!!

گریمان شیعەکان لە بەشی باکووری لوبنان و سوننەکانیش لە بەشی باشوورەکەیدا دابوونایە، ئایا پێتان وایە کە شیعەکان لەپێناو

رزگارکردنی ئەو بەشەی سوننەکان بجەنگایە؟! لە ڕاستیدا ئەمە مەحاڵە مەحاڵە. بەڵکو لەوانە بوو دابەشبوونی هێمنانەی خاکی لوبنانی لە نێوان شیعە و جولەکەکانی لێبکەوتایەتەوە، ئەم قسەیەش بێ بەڵگە نیە، دەیان ساڵە شیعەکان لە لوبناندان، ئایا تاوەکو ئێستا جولەیەکیان لە دژی جولەکان لە فەڵەستین دا، هەر چەندە لە ئەدەبیاتی خۆیاندا دەڵێن فەڵەستین وڵاتێکی داگیرکراوە لەلایەن جولەکەکانەوە.

زانای پایەبەرز، دکتۆر موستەفا سوباعی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) کە چاودێری ئیخوانولموسلمین بوو لە سوریا، لەکاتی شەڕی ساڵی ١٩٤٨ی زایینیدا هەوڵی زۆری دا کە سوننە و شیعەکان لێکنزیك بکاتەوەو پاڵ بە شیعەکانەوە بنێت تاوەکو بەشداری سوننەکان بکەن لە رزگارکـردنـی فـەلەستیندا، بەڵام ڕەتیانکردەوەو خۆیـان لەمە بـەدوورگـرت، تـا ئـەو ڕادەی دکتۆر مســتەفا سـوباعی تووشی بێئومێدی بــوو، لە کتێبەکـەی بەناونیشانی (سوننە و پلەوپایەی لە تەشریعی ئیسلامییدا)[1] نووسیویەتی کە نزیکبوونەوە لە نێوان سوننەو شیعەکان بوونی نییە، چونکە پێیان وایە ئەمە بریتیە لە زاڵبوونی



د. موستەفا سوباعی

---

(١) بڕوانە، مستەفا سوباعی : السنة و مكانتها في التشريع الاسلامي، لاپەڕە ٢٤، چاپخانەی دارولئەوراق، نوسینگەی ئیسلامی.

سوننەکان بەسەر شیعەکان، نەك یەکگرتن لەسەر بنەما هاوبەشەکان.

کاتێك جەنگی ساڵی ١٩٦٧ ی زاینی دەستی پێکرد، شیعەکانی ناوچەی باکووری فەڵەستین لە شوێنی خۆیاندا نەجوڵان، بەڵکو موسای صەدر دروشمە بەناوبانگەی لە مانگی ئاداری ١٩٧٣ی زاینیدا ڕاگەیاند کە دەیووت: "چەك جوانی پیاوانە" لەگەڵ ئەوەش کاتێك تەنها دوای تەنها شەش مانگ لەم ووتەیە لەجەنگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٧٣ی زاینیدا، تەنانەت یەك شیعیش لە شوێنی خۆی بۆ جەنگان لەدژی جولەکان لە فەڵەستیندا نەجولایەوە! لەوانەشە هەموو لایەك ئاگاداری جەنگی ئەم دواییانەی غەززە بێ لە ساڵی ٢٠٠٩ ی زاینی، کە دەکرا موشەکەکانی حیزبوڵڵا رژێمی زایۆنی جولەکەی دوژمنی سەرقاڵ بکردایە لە موشەك بارانکردنی چڕی شاری غەززەدا، بەڵام جگە لە چەند ووشەیەك نەبێ هیچیترمان لە حیزبووڵڵا نەبیست، تەنانەت یەك موشەکیشی بۆ پەرتەکردنی زایۆنیەکان نەهاویشت.

لێرەوە، ڕژێمی زایۆنی دوژمن باش دەزانێ کە مەترسی حیزبوڵڵا سنورداره لەچوارچێوەی خاکەکەیدایە، دەشزانێ لە قۆناغی ئێستادا نە حیزبوڵڵا و نەئێرانیش چاویان لە فەلەستین نییە، هەروەها ئەمریکاش دەزانێ کە ئەو هوتاف و دروشمانەی ئێران دەیانڵێتەوە لە دژی ئەمریکادا هیچیەکیان ڕاستەقینە نین، تەنهاو تەنها بەمەبەستی ڕاکێشانی هەست و سۆزی موسلمانانە لە ڕاگەیاندنەکانەوە، ئەگینا با سەیرێکی پرۆژەی شیعەکان بکەین لە ئێراق کە چۆن بەچاودێری ڕوون و ئاشکرای ئەمریکا جێبەجێدەکرێت..بەڵکو تەنانەت ئەمریکا لاری نییە لە دروستکردنی دەوڵەتێکی گەورەی شیعەکان کە ئێران

و ئێراق و سوریا و لوبنان بگرێتەوە؛ چونکە ئەوکات ئەم دەوڵەتە دەبێتە مایەی دروستکردنی هاوسەنگیەك بۆ هێزە ئیسلامیەکانی ناوچەکە، بە شێوەیەکی ئۆماتیکی لەبەردەم ئەو هەڵکشانە سوننیەی ئیسلامیە دەوەستێت کە خۆی لەم ڕابوونە ئیسلامیە دەدۆزێتەوە کەلە زۆربەی وولاتەکانی ناوچەکەدا پەیدا بووە، بە تایبەت لە میسر و سعودیە و ئوردوندا، کە ئەمانەش ئەو وولاتانەن کە ئەمریکا لەلایەن خۆیەوە هەوڵ دەدات کە دەسەڵاتیان کەم بکاتەوە و لاوازیان بکات، جا لەلایەنی سیاسی بێ یان لایەنی سەرباز یاخود لایەنی ئابووری بێ.

سـێیەم:

سەرکەوتن مانای ڕاستی و دروستی ڕێباز ناگەیانێ، یان بەپێچەوانەش تاقیکرنەوەش بە نەهامەتیش مانای لەناوچوون ناگەێنێ، چەندین لەوانەی کە سەرکەوتووبوون لەکاتێکدا لە ریزی بیدعەچیەکاندا بوون! شیعە قەرامیتیەکان نزیکەی زیاتر لە سەد ساڵ باڵا دەست بوون لەسەر ڕووی زەویدا، لەگەڵ ئەوەی کە حاجیانی ماڵی خودایان دەکوشت، و تەنانەت بەردە ڕەشەکە (الحجر الاسود)یان لە ماڵی خودا دەرهێنا و وێرانکاری و گەندەڵیەکی زۆریان لەسەر زەوییدا بڵاوکردەوە، هەریەکە لە رۆمانی و مەغۆل و ئینگلیز و ئەمریکیەکان باڵا دەست بوونە لەسەر زەوی لەگەڵ ئەوەی ڕێبازیان چەوت و گەندەڵ بووە، بەهەمان شێوە کاربەدەستە ستەمکار و خۆبەگەورە زانەکانی مسولمانانیش باڵا دەست بوون، و لەکاتێکدا لەڕاستە شەقامی ئیسلامەتیش لایان داوە، و چەندەها ساڵیشە فەرمانڕەوایەتی گەلەکانیان دەکەن.

سەرکەوتن و دەستڕۆیشتن مانای ڕاست و دروستی ڕێباز ناگەیێنێ، بەڵکو پێویستە موسلمانان سەیری گفتارو ڕەفتارەکان بکەن، بزانن ئاخۆ بپێی قورئان و سوننەیە یان نا، چەندین کەس هەبووە لە ناو بەرەکانی جەنگ بووە هەروەکو پاڵەوان خۆڕاگر بوونەوە، بەڵام لە ئەهلی ئاگری دۆزەخ بوون، چونکە ئەمانەیان بۆ خودای گەورە ئەنجام نەدابوو، پیاوێك لەسەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) هەبوو، لە بێبڕواکانی دەکوشت و برینداری دەکردن، خەڵکی وایان گومان برد کە ئەو کەسە گەورەترینی موسلمانانە، پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم) هەواڵی دانێ کە ئەوکەسە لە ئەهلی ئاگرە. کاتێك چوونە لای بینیان وا لە ساتەوەختەکانی کۆتایی ژیانیەتی، پێیانی ووت: "من لەپێناوی گەلەکەمدا دەجەنگام!"[(١)]

چونکە جەنگانەکەی لەپێناو خودای گەوەرە (عز وجل) نەبوو، بەڵکو لەپێناو بەرژەوەندی خۆی بوو، سەرخستن و خۆڕاگرییەکەی لەسەر بنەمایەکی چووچ بوو، ئێمە ناڵێن دەستدەخەینە ناو مەبەست و نیەتی حیزبوڵلا، چونکە کەسێ نیەت نابینێ جگە لە خودایی گەورە (عز وجل)، بەڵکو ئێمە قسە لەسەر بیروباوەرە ئاشکراکەیان و بیدعەو شتەداهێنراوەکانیان دەکەین. سەیرێکی ئەو بەشە بکەنەوە کە بەناونیشانی "دەستڕۆیی شیعەکان" بوو، دەبینن کە پرپەتی لە

---

(١) بڕوانە: ابن هیشام: السیرة النبویة، تحقیق مصطفی السقا و آخرون - دار المعرفة- بیروت القسم الاول (الجزئین الاول والثانی) لا ٥٢٤، ٥٢٥. و ناوی پیاوەکەش قزمان بوو، کە هاوپەیمانی هۆزی بەنی زەفەر بوو.

سەرکەوتن و سەرخستنی شیعەکان، بەڵام سەرخستنی پڕەنسیپ و بناما نەبووە، بەڵکو بریتیبوو لە لادان لەڕاستەشەقامەکە.

## هەڵوێستی سوننەکان

**چوارەم:**

کاتێك دەڵێین: شەڕی نێوان حیزبوڵڵا و جولەکەکان شەڕی بەرژەوەندییەکانە، واتای ئەوەنییە کە مسوڵمانی سوننی لەبەرامبەر ئەم شەڕە هەڵوێستێك وەرنەگرن، لێرەدا من هاوڕا نیم لەگەڵ زۆرێك لە مامۆستایان و بانگخوازن کە پێیان وایە: کە دەبێ بەتەواوی خۆمان دوورە پەرێز بگرین هیچ دەستنەخەینە ناوئەم شەڕەوە چونکە هەردوولا سەرلێشێواو گومڕان؛ بەڵام مسوڵمان پێویستە ڕۆڵی ئەرێنی و ئیجابی هەبێ، دەتوانێ هەڵسەنگاندن بۆ شتە خراپەکان و بەرژەوەندیەکان (المفاسد و المصالح) ئەنجامدا، ئەو شەڕەی نێوان زایۆنیە داگیرکەرەکانی فەلەستین، و حیزبوڵڵا، کە لەسەر خاکێ دەژیێ کە بەشێکی لەلایەن زایۆنیەکانەوە داگیرکراوە. لێروە دەڵێین: بێهێزکردنی جولەکەکان خۆی لە خۆیدا ئامانجە، ستەمکاری و داگیرکاری جولەکەانیش ڕوون و ئاشکرایە، رزگارکردنی خاکی لوبنانیش لەژێر چەپەڵۆکی جولەکەکان کارێکی پێویستە، پاشانیش پێویستە مسوڵمانانیش خۆیان کاروباری خۆیان رایبکەن بەشێوەیەك پارێزگاری لەمافەکانیان بکەن و لە مەترسی جولەکە و حیزبوڵڵا دەستکەوتەکانیان بپارێزن.

خۆم بەش بەحاڵی خۆم، ئەم هەڵوێستەی سوننەکانم بەکارێکی گەورە هاتە پێشچاو کاتێك لە ساڵی ١٩٩٧ی زاینیدا بەهێزێکی زۆرەوە چوونە ریزی بەرەکانی بەرگری لوبنانی (المقاومە اللبنانیە) کە کاریانکرد بۆ دەپەڕاندنی جولەکەکان لە لوبناندا، سەرەڕای ئەوەی کە سەرکردەی هێزەکانی سوپاکە هی حیزبوڵڵا بوون، هەرچەندە دوای ئەمە حیزبوڵڵا هەوڵ و ماندووبوونی سوننەکانی دزی و نکۆڵی هەوڵ و ماندووبوونەکانی کرد، بەڵام ڕاستیەکە لەلای مسوڵمانان بە ڕوون و ئاشکرایی مایەوە.

لەڕاستیدا، جارێکیان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ پیاوێکی بتپەرست ڕاوەستا تاوەکو ئەو ماڵەی کە ئەبو جەهل لێی زەوتکردبوو بۆی وەرگرێتەوە، خۆ ئەو کاتە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەیفەرموو: ئەم پیاوە ئەو ماڵە زەوکراوەی وەردەگرێتەوە بۆ ئەوەی بیکاتە قوربانی تاوەکو لە (لات و عوززا) نزیك بێتەوە، نا بەڵکو لەم هەڵویستە لەگەڵی دابوو، و پاشانیش لە هەڵوێستێکی دیکەدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پیاوەکە بۆ لای خوای گەورە (عز وجل) بانگ دەکات.[١]

هەڵبەتە، شتەکانانمان لێتێکەڵ نابێت؛ ئێمە هەست بەترسناکی پڕۆژەی شیعەکان لەناوەچەکەدا دەکەین، بەڵام لەهاوکات درك بە مەترسی پڕۆژەی جولەکەکانیش لەو ناوچەیەدا دەکەین.

---

(١) سەیری هەمان سەرچاوەی پێشوو بکە: القسم الاول (الجزئین الاول و الثاني) ل ٣٨٩، ٣٩٠.

پێنجـــەم:

حەسەن نەسرولڵا کەسایەتیەکی کاریزمی (موگناتیسی) یە، بەو واتایەیی ئەو کەسایەتیەکی خاوەن سروشتێکی ئەو تۆیە کە دەتوانێ کاریگەری بکاتە سەر کەسانی دەوروبەری، و پێشڕەوی کۆمەڵەکان بکات، هەستە و نەستیان ببزوێنێ، لەڕووی سیاسەتمەدارییەوە بەپلەی یەکەم دێت، و بیرێکی تیژی هەیە، و خێراشە لەبڕیاردانی خێرای بێبیرکردنەوەدا..بەڕای من هیچ بەربەستێك نییە لەوەی کە لە ڕووی سیاسی و کارگێڕی یەوە پێیەوە سەرسام بیین، بەڕاشکاویەوە دەڵێم کە لەلایەنی شێوازی گوتاردانی و تێگەیشتنی لە کاروباری سیاسیەوە پێیـــەوە ســـەرسام ببین. لەمانە هیچ



بەربەستێك نابینم لەوەی کە مسوڵمانان ئەم هەستەیان بەرامبەری هەبێ و تەنانەت لەهەندێ لەم کارانەی دا چاوڕیشی لێبکەن، بەڵام ئەوەی نەشیاوە و ناشگونجێ ئەوەیە کە پێیەوە سەرسام بین ئەوەیە کە وەکو سەرکردیەکی ئیسلامی سەیری بکەین کە جیهاد دەکات بەو شێوەیەی کە خودای گەورە (عز وجل) فەرمانی پێکردووە؛ چونکە

ئەو سەرکردەیەی کەبەم شێوەیەیە دەبێ لەڕووی بیروباوەڕ (عەقیدە)ەوە ساغ و سەلیم بێ، و پەرستش وعیبادەشی ڕاست و دروست بێ، لەسەر ڕێباز و ڕێڕەوەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بێ، بەگوێرەی ئایەتەکانی خودای گەورە(عز وجل) کاربکات، هیچ یەکێکش لەم خاسیەتانە لەکەسایەتی حەسەن نەسرڕوڵڵادا نییە.

## بیروباوەڕی حەسەن نەسرڕوڵڵا

لەڕووی مەزهەبەوە، حەسەن نەسرڕوڵڵا دوازدە ئیمامیە، واتە بەهەموو بیروباوەرەکانی ئەم مەزهەبە دینداری دەکات، باوەڕی وایە کە هاوەڵان پێشەوایەتی و خەلافەتیان لە ئیمامی عەلی (رضي الله عنهم) زەفتکردووە و داویانە بە ئیمامی ئەبوبەکر و دواتر بە ئیمامی عومەر و پاشانیش بە ئیمامی عوسمان (رضي الله عنهم). وەپێی وایە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەسیەتی کردووە بەم دوازدە ئیمامە بەناوەکانیانەوە(واتا: بەناو ناوی هێناون!)، و باوەڕیشی بە مەعصومیەت و بێتاوانی ئەم ئیمامانەشیان هەیە، و باوەڕیشی بەوەهەیە کە ئیمامی دوازدەهەمیان چۆتە ژێرزەمین و هێشتا هەرزیندووەو ڕۆژێك دادێ دێتەدەرەوە، و باوەڕیشی بەوە هەیە کە توقیە (درۆکردن بۆ شاردنەوەی ئەم بیروباوەڕانە، یان ووتنی شتێك بەڕواڵەت و شاردنەوەی شتێکی تر لەناخدا)، نۆ لەسەر دە(١٠/٩) ی ئایینە.

بەهەمان شێوە حەسەن نەسرڕوڵڵا باوەڕی وایە کە سوننەکان دژایەتی ئالوبەیتیان کردووە، لەگەڵ ئەوەی کە سوننەکان زیاتر لە شیعەکان ڕێز لە ئالوبەیت دەگرن، بەڵکو سوننەکان لەسەر ڕێبازی پێغەمبەری خوان

(صلی الله علیه وسلم). هەروەها پێشیوایە کە ئیمامەکانیان مافی خۆیانە کە پێنج (خومس) یەکی ئەو ماڵ و موڵکەی کە هەرتاکێکی شیعە بەدەستی دەهێنێ وەربگرن بۆ خۆیان. باوەڕیشی وایە کە هاوسەرگیری سیغە (موتعە) حەلال و دروستە، لەلای ئەو دروستە گەر گەنجێك بچێت بۆ لای هاوڕێ یە کچەکەی و یا هەرکچێکی دیکە بۆ ماوەی ڕۆژێك یا کاژمێرێك مارەی بکات، تاوەکو ئارەزوویی خۆی پێدابمرکێنێتەوە و دوای ئەم ماوەیە تەڵاقی بدات. هەروەها حەسەن نەسرولّلا باوەڕی بە فەرمانڕەوایەتی شەرعزان(ویلایەتی فەقیهـ) یش هەیە، هەروەها سەرپێچیکردنی ڕێبەری گشتی شۆرشی ئیسلامی ئێرانی عەلی خامەنەیی شتێکی حەرامە لەلایی ئەودا، هەروەها چەندین شتگەلی تر هەن کە ئەو باوەڕی پێیەتی و پێچەوانەی بنەماکانی ئایینی ڕاست و دروستی ئیسلامن.

هەموو ئەو شتانەی کەهەر ئێستا باسمان لێوەکرد بریتیە لەبیرو باوەڕی قایم و تۆکمەی حەسەن نەسرولّلا، ئەمەش هیچ مانایەکی نییە گەر یەکێ بڵێ: ئێمە گوێمان لەو نەبووە جوێن بە هاوەڵان بدات، یاخود تانە لە دایکانی ئیمانداران بدات. من بەو کەسە سادانە دەڵێم: پێویست ناکات کە تۆ لە حەسەن نەسرولّلا ببیستیت تاوەکو دڵنیا بیت کە ئەو بیروباوەڕی بەم شێوەیە، چونکە ئەم بیروباوەڕە لە بنەما نەگۆڕەکانی مەزهەبی دوازدە ئیمامییە، باشە خۆ تۆ گوێت لە دراوسێیە مسوڵمانەکەی خۆت نابێ کە بڵێ: لا اله إلاّ الله مُحمد رَسولُ اللهِ، بەڵام تۆ دەزانی کە باوەڕی ئەو دراوسێیەت بەم شێوەیە چونکە مسوڵمانە، بەهەمان شێوە کەسێکی دوازدە ئیمامیش دەبێ باوەڕی

بەهەموو ئەو شتانە هەبێ کە باسمکرد، و ناشبێ بچێتە سەر هیچ مەزهەبێکی تریش. ئەگەر بهاتباو حەسەن نەسرڵلا ڕێزی لە هاوەڵان ناباو دانی بە پلەوپایەیانی دانابا ئەوا ئەوکاتە بنەماکانی دوازدە ئیمامی بەچاك و پاك لەقەڵەم نەدەدا، هەروەها نەشی دەتوانی بەڵگە بۆ ئیمامەتی عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب و حەسەن و حوسەینیش (رضي الله عنهم) و جگەلەمانەش لە ئیمامەکانیان بهێنێتەوە.

ئەو کەسایەتیەی بەم هەموو شتە بێبنەماو پڕوپوچ و بیدعانە ڕازی بێ ناگونجێ و شیاویش نییە هەرگیزاو هەرگیز پێی سەرسام بین، و ناش بێ بیکەینە نموونەی سەرکردیەکی تەواو بۆ مسولمانان، بەڵام دەکرێ هەندێ شتی لێوەربگیردێت هەروەك چۆن هەندێ شت لەغەیری ئەو وەردەگیردرێت، لەبەر ئەوە نا کە ئەو کەسایەتیەکی ئیسلامی بێ، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە ئەو کەسێکە کە خاوەنی بەهرەو توانایە.

لەڕاستیدا مێژووی ئیسلامی داگیرکاری فەلەستین و شامی بەخۆیەوە بینیوە لەپێشوودا لەلایەن خاچپەرستاندا، ئەمەش لەسەردەمی بوونی دەوڵەتێکی شیعی گەورە، بەناوی دەوڵەتی عوبەیدیەکان کە فەرمانڕەوایەتی میسری دەکرد، سەرەڕای ئەم داگیرکاریەی خاچپەرستان مسوڵمانە ڕاستگۆکانی ئەوکات هیچیەك لەم خراپەکارانەیان نەکرد بە پێشەوای خۆیان، لەگەڵ ئەوەی ئەم سەرکردانە لە ئاستێکی زۆر بەرزی سیاسی و کارگێڕی و هونەرەکانی جەنگ دابوون، لەجیاتی ئەوە، مسوڵمانان سەرکردەیی دڵسۆزی نموونەیی خۆیان دروستکرد، کە ئەوانیش بریتی بوون لە:

عیمادەدینی زەنکی و نورەدین مەحمود و صەلاحەددینی ئەیوبی.

ئەوەی کە دەبێ ئێستا ئێمە سەرقاڵی بین ئەمە..دوای ئەوەی زانیمان پرۆژەی شیعەکان چییە، کەوا خەریکە پێدەگات و لە ئێران و عێراق و لوبنان دا سەردەکەوێت، ئەی باشە ئەو پرۆژەیەی سوننەکان لەکوێیە کەلەگەڵ هاتنە پێشەوەی مەسەلەی یەکسانی پرۆژەی شیعەکاندا ڕادەوستێ، و پاشان پێشی دەکەوێت و سەریدەکەوێت؟!

بێگومان ئێمە بەیەکێ لەفەرمانڕەوا زۆرەکانمان ئامادەدەکرێن تاوەکو پرۆژە گەورەکەی سوننەکان بگرێتە ئەستۆی خۆی، ئەو فەرمانڕەوایەی کە پشت بەقورئان و سوننەت ببەستێت، ئەوەی کە لەسەر ڕێبازی پێشینە چاکەکانمان بڕوات، ئەوەی کە داکۆکی لە مافی مسوڵمان دەکات لەسەرانسەری گۆی زەوییدا، ئەوەی پشتیوانی لە ئەهلی سوننەی ژێردەستەی ئێران و عێراق و لوبنان و سوریا دەکات، ئەو فەرمانڕەوایەی کە بەتوندی بەرامبەر پرۆژەی زایۆنیەکان و ئیستیعماری دەوەستێتەوە لە وڵاتی مسوڵماناندا.

بەڵام ئەگەر فەرمانڕەوایەك نەبوو کە ئەم ئەرکە بگرێتە ئەستۆی خۆی، ئەوکات ئێمە داوا لەمسولمانان دەکەین کە بە مەنهەج و ڕێبازی خۆیاندا بچنەوە، لێپیچینەوە لەگەڵ خۆیدا بکاتەوە، بەویستی خۆیی و بەملکەچی یەوە بۆلای پەروەردگار، بێگومان خودای پەروەردگار (عز وجل) پێشەوای دڵسۆز لەم ئوممەتە قەدەغە ناکات، تەنها ئەوکاتەنەبێ کە ئەم ئوممەتە خۆی بەفیرۆدەر و سەرپێچیکاری فەرمانەکانی خوای گەورە بێ، ئێمە چۆن بین سەرکردەکانیشمان

ئاوەها دەبن، خودای گەورە بەقەد گەردیلەیەکیش ستەم ناکات.. گەر ئێمە لەگەڵ خودا بین ئەو کات خوداش لەگەڵمان دەبێ، با ئایینی خودای گەورە سەربخەین، خوداش ئێمە سەردەخات، بابگەڕێینەوە بۆلای ئەو، و ئەویش قەبوڵمان دەکاتەوە،و لێشمان دەبورێت، و بۆ ڕاستەشەقامەکەی ڕێنموویمان دەکات.

# چـــیرۆکی یـــەمـــەن

یەمەن بریتی بووە لە وولاتانەی کە پاڵپشتێکی سەرەکی ئوممەی ئیسلامی پێکهێناوە هەرلە رۆژگارە زووەکانی ئەم ئایینەوە، لەڕاستیدا خەڵکی یەمەن کۆمەڵ کۆمەڵ دەهاتنە ناو ئایینی ئیسلام هەر لەسەردەمی پێغەمبەری خوداوە(صلى الله عليه وسلم)، و یەمەنیەکان بەشدارێکی کارا پێشرەوی ئوممەی ئیسلامی، تائەو ئاستەی کە جەنگاوەر و پاڵەوانەکانیان نیاشانە و هێمای دیاریان لە فتوحاتی ئیسلامیدا هەبووە، یەکێ لە بەشداربوونە دیارەکانی یەمەنیەکان لە بزوتنەوەی فتوحاتەکان بریتی بوو لەوە هەوڵ و تێکۆشانەکانیان لە رزگارکردنی وڵاتی شام و میسر و باکووری ئەفریقا و ئەندەلوس و چەندین شوێنی تری جیهانی ئیسلامی دا.

بەشدارییە چالاکەکانی یەمەنییەکان تەنها لەگۆڕەپانی جیهادو فتوحاتەکان نەبوو، بەڵکو بەشداری زۆر چالاکانەشیان هەبوو لەخزمەتکردنی مەشخەڵی ڕێگای زانست و زانایاندا، ئای ئەو زانایانایە چەندە زۆرن کە بەمەبەستی وەرگرتنی زانست لەسەر دەستی بلیمەت و بیرمەندانی گەشتیان کردووە بۆ وولاتی یەمەن! مەگەر

بەڵگەی ئەمە نییە، کاتێك ئیمامی زۆر بەڕێز ئەحمەدی کوڕی حەنبەل موکرِ دەبێ لەسەر ئەوەی کە بچێت بۆ یەمەن بەمەبەستی تەواوکردنی خوێندنی تێیدا، ئەمە سەرەڕای دەستکورتیەکەی کەوای لێکرد کە بەپیادەیی رێبکات لە شاری بەغداوە بڕوات بۆ یەمەن، ئەمەشی لەبەر زۆرگرنگی مەسەلەکە بوو، تاوەکو هەندێ لایەنی زانستی خۆی کامڵ بکات.

بێگومان کاتێك باسی یەمەن دەکەین، مەبەستمان تەنها زانا و تێکۆشەران و سەرکردە و بیرمەندان نییە، بەڵکو مەبەستمانە باسی تەواوی گەلی یەمەن بکەین، یەمەنیەکان بەشێوەیەکی گشتی لە گەلە هەرە ناسك و باشترینەکانن، لەڕاستیدا، پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم) گەواهیەکی گەورەی بۆ داون، کە ئەم گەواهیدانە بۆ ئەوان باشترە لە دونیا و لەوەی لەناو دونیادا هەیە، ئەمەش لەوکاتە دا بوو کاتێك وەفدێك لە یەمەنەوە هات بوو بۆ شاری مەدینەی مننەوەرە، و پێغەمبەری خودا فەرمووی:

((أتاكم أهلُ اليمنِ، هُم أرَقُّ أفئِدةً وألْيَنُ قُلُوباً، الإيمان يَمانٍ، والحكمةُ يمانيةٌ)) [1].

واتە: خەڵکی یەمەن هاتوونەتە لاتان، کەدڵ ناسکترین و دڵنەرمترینی خەڵکین، لەڕاستیدا ئیمان و دانایی یەمەنین. لەڕاستیدا من خۆم ئەمە بەیەکێ لە موعجیزاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه

---

(١) البخاري كتاب المغازي، باب قدوم الأشعريين وأهل اليمن(٤١٢٧)، ومسلم: كتاب الإيمان، باب تفاضل أهل الإيمان فيه ورجحان أهل اليمن فيه(٥٢).

وسلم) دادەنێم کەخۆم بینیومە و شارەزای بووم، مامەڵەم لەگەڵ زۆرێك لە یەمەنییەکاندا کردووە، لەهەموو ماڵەوە و تێکەڵاویکەاندا بەم شێوەیە بوونە کە خۆشەویستم (صلی الله علیه وسلم) وەسفی کردوون-کەدڵ ناسکترین و دڵنەرمترینی خەڵکین. ئای دەبێ چەندە ئەم دوعایەی پێغەمبەری خودایان (صلی الله علیه وسلم) بۆکرابێت کاتێك دەیفەرموو:

(( اللّهُمَّ بَارِك لَنا فِي شامِنا، اللَّهُمَّ بَارِك لَنا فِي يَمَنِنَا ))[1].

واتا: ئەی خودایە بەرەکەت بخەیتە ناو شام مانەو، ئەی خودایە بەرەکەت بخەیتە ناو یەمەن مانەوە.

## هاتنی ئیسلام بۆ یەمەن و چیرۆکی زەیدییەکان

هەروەکو باسمان کرد، چیرۆکی هاتنی ئیسلام بۆ ناو یەمەن کۆنە، ئیسلام هەر لە سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چۆتە ناو یەمەن، پاشان یەمەن بوو بە هەرێمێکی گرنگ لەناو دەوڵەتی ئیسلامیدا، بەهەمان شێوە لەسەردەمی خولەفایی ڕاشیدین، و لەسەردەمی خەلافەتی ئەمەویەکان و لە سەرەتای خەلافەتی عەبباسیەکان.

لەسەردەمی خەلافەتی عەباسی، مەئمون دا، بەووردتر لەساڵی ١٩٩ی کۆچی دا، یەکێ لەزەییدیەکان بەناوی موحەممەدی کوڕی

---

(١) البخاري: كتاب الفتن، باب قول النبي صلى الله عيله وسلم الفتنة من قبل الشرق (٦٦٨١)، والترمذي (٣٩٥٣)، وأحمد (٥٩٨٧).

ئیبراهیم تەباتەبا لە شاری کوفە لە خەلیفە مەئمون، و ئامۆزای خۆی نارده یەمەن بەمەبەستی زیادکردنی پشتیوانانی. زەییدیەکان شوێنکەوتووی ئەو ڕێبازەن کە زەییدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەین ی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بنەماکانی داناوە، ئەم ڕێبازە لەسەر بەرێبازێکی شیعی ئەژمار دەکرێت ئەگەرچی زۆر لەئەهلی سوننە نزیکن، ئەوان زۆر لەو بیدعە و قسەبێبنەمایە ناکەن کە شیعەی دوازده ئیمامی(کە شیعەکانی ئێران و عێراق و لوبنان و کەنداوی عەرەبی ) ئەیلێن، زەییدیەکان وەکو تەواوی مسوڵمانان بە قورئان سوننەت ڕەفتاردەکەن، جگە لەمە نەبێ، کەئەوان هەندێ بیرو ڕای جیاوازیان هەیە لە مەسەلەی ئیمامەتی دا، ئەوان ئیمامەتی سنوردار دەکەن و پەیوەستی دەکەن بە نەوەی عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب، لە ڕێی فاتیمە (رضي الله عنهم)ی کچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)وە، بەڵام هیچ کەسێکی دیاریکراو دیاری ناکەن لەم وەچەیە، بەڵکو دەڵێن: ئەوکەسەی کە مەرجەکانی ئیمامەتی تێدایە وەکو لە نەسەبی عەلی و فاتیمە (رضي الله عنهم) بوون، و زانست و تەقواو باشی لە ڕاووبۆچوونیدا، پێویستە لەسەری کە بانگەوازی خەڵکیش بکات بۆلای خۆی، کاتێك خەڵکی بەیعەتیان پێدا ئەوکاتە ئیمامەتییەکەی دادەمەزرێ، زەییدیەکان بوونی دوو ئیمام لەکاتدا بەڵام لەدوو شوێنی جیاوازدا بە جائیز دائەنێن، بەدرێژایی قۆناغە جیاجیاکانی مێژوو زۆرێك لەوان دەرکەتوون.

هەربەم بۆنەوە، زۆرێك لەزاناکانی ئەهلی سوننە زەیدی کوڕی عەلی بەیەکی لە زانا بەرێزەکانی ئەهلی سوننە لە قەڵەمی دەدەن،

هەبەم شێوەیەش بوو، یەکێ بوو لە زانا بەناوبانگەکان، بانگی خەڵکی دەکرد کەلە پێشەواو سەردەی ستەمکار ڕاپەڕن، و پلەوپایەیەی صەحابەکانی بەرز ڕادەگرت، ڕیزی لە ئەبوبەکر و عومەر دەگرت، جگەلوە نەبێ کە ئەو پێوابوو کە عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب(رضي الله عنهم) لەوان باشترە، کەئەمەش ڕاست نییە، سەرەڕای ئەم بەچاکتر سەیکردنەی زەید بۆ عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب، بەڵام هێشتا ئەو داندەنێ بەڕاست و دروستی خەلافەتی ئەبوبەکر و عومەر (رضي الله عنهم)؛ چونکە بەڕای ئەو جائیزە لەکاتی بوونی باشترین کەس کەسێکی باش ببێتە خەلیفە، بەمەش زەیدییەکان بەشێوەیەکی ڕیشەیی لە دوازدە ئیمامیەکان چیادەکرێنەوە، کە ئەوان خەلافەتی ئەبوبەکر و عومەر بەتەواوی ڕەتدەکەنەوە، تەنانەت بەگومانی خۆیان پێیانوایە بەهۆی لەعنەت کردنیان لە ئەبوبەکر و عومەر(رضي الله عنهم) ەوە لەخوداگەورە نزیك دەبنەوە.

## زەیدییەکان لەسوننەکان نزیکترن

لەسۆنگەی ئەم ڕاستییەی کەباسمانکرد، زەیدییەکان ئەگەرچی لەریزی شیعەکان ئەژمار دەکرێن بەڵام خاڵی هاوبەشیان لەگەڵ سوننەکان زۆر زۆر زیاترە لەوەی لەگەڵ شیعەکان، کەسێ ناتوانێ بەئاسانی زەیدیەك لە سوننەیەك جیابکاتەوە، من خۆم لە وولاتی یەمەندا بەزۆرێك لەوان گەشتم، کە لەصەحابەکان ڕازین و ڕێزوشکۆی زۆریان بۆیان هەیە، لەگەڵ سوننەکان لەمزگەوتەکاندا نوێژدەکەن، ئەم بیدعەو خوڕافیاتانەی دوازدە ئیمامیەکان هەیانە زەیدیەکان نیانە، کە



لەهەردووبەشی "بنەماکانی شیعە" و "دەسترۆیشتنی شیعەکان" دا باسمان لێوەکرد، تەنانەت زانای زۆر بەڕێزیشیان هەبووە، کەزۆرێك لە زانستخوازی سوننە مەزهەب لەخزمەتیاندا زانستیان وەرگرتووە، بۆنموونە زانای بلیمەت و بەتوانا ئیمامی شەوکانی کە خاوەنی کتابی نەیل و لئەوتارِ (نیل الأوطار)ە، زەیدییێکی یەمەنی بوو(رحمة الله).

دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی مەئمون، کاتێك کە شۆڕشی موحەممەدی کوڕی ئیبراهیمی تەباتەبا بەرپابوو لەشاری کوفە، بەڵام بەمەئمون توانی کە ئەم شۆڕشە بەزەبری هێز ڕیشەکێش بکات،بەڵام سەبارەت بەشۆڕشی ئیراهیمی کوڕی موحەممەد لە یەمن هیچی پێنەکرا. لەوانە هۆیەکەی بگەڕێتەوە بۆ دووری وڵاتی یەمەن لەشاری بەغداوە، هەروەها لەبەر سروشتی جوگرافیای شاخاوی سەختی یەمەنیشەوە بوو، بەهەمان شێوە سروشتی خیلەکی لەیەمەن کەوادەکات کۆنترۆڵکردنی ناوەندی (السيطرة المركزية) کارێکی ئەستەم بێت. لەبەر تەواوی ئەم هۆکارانە مەئمون پەنایی بردە بەر شێوازێکی دبلۆماسی و فەرمانڕەوایەتی وڵاتی یەمەنی دا بە ئیبراهیمی کوڕی موحەممەدی زەیدی مەزهەب بەو پێیەی کەببێتە پاشکۆی مەئمون، هەربەم شێوەیەش بوو،و تەمنی پاشکۆیەتی یەمەن بۆ خەلافەتی

عەبباسی نزیکەی یەك سەدەی خایاند، بەڵام ئەمەش بەبەرژەوندی بڵاوبوونەوەو ڕەگداکوتانی مەزهەبی زەیدی تەواو بوو لە یەمەندا. دوابەدوای ئەم ڕووداوانە، دوای دەیان ساڵ، بە دیاریکراوی لەساڵی ٢٨٤ی کۆچیدا، و لەسەردەمی لاوازی خەلافەتی عەبباسیدا، یەحیایی کوڕی حەسونی ڕەسی توانی دەوڵەتێکی زەیدی لەیەمەندا دابمەزرێنێت، کە بەناوی دەوڵەتی بەنی ڕەسی یان بەنی ئەئیمە دەناسرا، بەم شێوەیە یەمەن بەم دەوڵەتە لەدەسەڵاتی عەبباسی جیابووەوە، بارەگایی ئەم دەوڵەتەش لەشاری صەعدەی باکووری یەمەن بوو، ئەمەش یەکەم دەوڵەت نەبوو کە لە خەلافەتی عەبباسی جیاببێتەوە، پێشتریش دەوڵەتی یەعفریونەکانیش لە صەنعا جیاببوونەوە، ئەمەش لە ساڵی ٢٣٠ی زاینیدا بوو، جگە لەوە نەبێ کە یەعفرییونەکان سوننە بوون نەك زەیدی.

## بانگەوازی ئیسماعیلیەکان لە یەمەن دا

هاوکات لەگەڵ ڕاگەیاندنی دەوڵەتی بەننی ڕەسییەکان دا بانگەوازی ئیسماعیلیە شیعیەکانیش لەیەمەندا سەریهەڵدا، بەڵام لەناوچەکانی باشووردابوو، هەروەکو لەهەردوو بەشی "ڕەچەڵەکی شیعەکان" و "دەستڕۆیی شیعەکان" ڕوونمانکردەوە کە ئیسماعیلیەکان بریتین لەمەزهەبێکی شیعی کە لادانێکی زۆریان تێدایە، بەئەندازەیەك کەوای لەزۆربەی زانایانی ئەهلی سوننە کردووە کە بەتەواوەتی لەبازنەی ئیسلامەتی دەریان بکەن، ئەم ئیسماعیلیانە دەستیانگرت بەسەر بەشی باشووری یەمەن دا، ئەمەش لەسەرتای ساڵی ٢٩٠ی

کۆچییدا بوو، بەڵام دەوڵەتەکەیان بەخێرایی لەساڵی ٣٠٤ی کۆچییدا ڕووخا، لێرەوە یەمەن لەنێوان یەعفیریوونە سوننەکان لە صەنعا و زەیدییەکانی بەنی ڕەسی صەعدە دا دابەشکرا، بارودۆخەکە بەدرێژایی سەدەی چوارەمی کۆچی بەم شێوەیە مایەوە. لەسەدەی پێنجەمی کۆچییدا دەوڵەتی یەعفیریەکان ڕووخا، هەروەها دەوڵەتی زەیدییەکانیش زۆر زۆر لاوازبوو، ئەگەر چی هەربەردەوام بوو، بەڵام دەوڵەتێکی سوننی سەرهەڵدا، ئەویش دەوڵەتی نەجاحیەکان (بەنی نەجاح) بوو، کە بارەگاکەی لە زوبێدی ڕۆژئاوای یەمەن دا بوو، کە لە ٤٠٣ تا ساڵی ٥٥٥ ی کۆچی بەردەوام بوو، لەتەك ئەم دەوڵەتەدا چەندین دەوڵەتی ئیسماعیلی ترسناك سەریان هەڵدا، کەئەوانیش دەوڵەتی بەنی صولەیح لە صەنعا لە ساڵی ٤٣٩ تا ٥٣٢ی کۆچی، و دەوڵەتی بەنی زورەیع لە عەدەن لەساڵی ٤٦٧ تا ٥٦٩ی کۆچی بوون، بەهەمان شێوە دەوڵەتی بەنی حاتەم کەدەستیگرد بەسەر شاری صەنعا لەساڵی ٥٣٢ تا ٥٦٩ی زاییینیدا، ئەم دەوڵەتانەی ئیسماعیلیەکان گشتیان کۆمەکی هاریکاریان لە دەوڵەتە بەهێزەکەی عوبەیدیەکان، کە بەدەوڵەتی فاتیمیەکان ناسرابوو، وەردەگرت، کە تەواوی وڵاتی میسری ئەوکاتی و هەندێ جار وڵاتی شامیشی لەژێر دەستدابوو، بۆیە ئەم دەوڵەتانەی ئیسماعیلیەکان نەڕووخان تا ئەوکاتەی دەوڵەتی عوبەییدییە پیسەکان لەسەردەستی پاڵەوانی سەرکەتوو صەلاحەددینی ئەیوبی ڕووخا، ئەمەش لە ساڵی ٥٦٧ی کۆچی دابوو. بەلەناوچوونی کابوسی ئیسماعیلیەکان لە یەمەندا سەردەمێکی نوێی خۆش دەستپێکرد لەگەڵ فەرمانڕەوای سوننی بەنوێنەرایەتی ئەیوبییەکان، ئەمەش



لەنێوان ساڵانی ٥٦٩ تا ٦٢٦ی کۆچییدا بوو، پاشانیش دەوڵەتی بەنی ڕەسولی سوننی لەساڵی ٦٢٦ تا ٨٥٨ی کۆچییدا.

لەگەڵ ئەمەشدا، فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی زەیدیەکان بەتەواوی لەیەمەندا بنەبڕنەبوو، بەڵکو لەصەعدە هەربەردەوام بوو، تەنانەت لەماوەیەکدا شکۆمەندییەکی بەرزیان هەبوو کە بە دەوڵەتی بەنی ڕەسی دووەم دەناسرا، ئەمەش لەنێوان ساڵانی ٥٩٣ تا ٦٩٧ ی کۆچییدا بوو، کە دەکاتە ماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەیوبی و ڕەسولییەکان.

## دەوڵەتی ئەئیمەکانی صەنعا

لەسەدەی دەیەمی کۆچییدا فەرمانڕەوایەتی وڵاتی یەمەن لەنێوان عوسمانی و زەیدییەکاندا دابەشکرا: بێگومان عوسمانیەکان فەرمانڕەوایەتی یەمەنیان لەنێوان ساڵانی ٩٤٥ تا ١٣٣٣ی کۆچییدا کرد، کە دەکاتە ٣٨٨ ساڵ، کەلەبنەڕەتدا بەشی باشوور لەژێر فەرمانڕەوایەتی ئەوان دابوو، بەڵام هەرچی بەنی ڕەسی زەیدیی بوون وەك عادەتی خۆیان دەستیانگرتبوو بەسەر صەعدە، ئەمە سەرەڕای صەنعاش، بۆ ئەم دەوڵەتە لەم ماوەیەدا بە دەوڵەتی ئەئیمەکانی صەنعا دەناسرێ، لەساڵی ٩٧٣ تا ١٣٨٢ی کۆچی(٤٠٩ ساڵ) بەردەوام بوو، دوا بەدوای ململانێ ی لەگەڵ خەلافەتی عوسمانی دەستیگرت بەسەر تەواوی یەمەن، کەلەبەرژەوەندی زەیدیەکان تەواوبوو لەساڵی١٣٣٣ی کۆچی.

ئەم دەوڵەتە زەیدییە وەك فەرمانڕەوای یەمەن مایەوە تاوەکو ١٣٨٢ی کۆچی= ١٩٦٢ زاینی، کاتێك کە شۆڕشی یەمەنی دەستیپێکرد،و کۆتایی هێنا بەحوکمڕانی زەیدییەکان کە سەرەتا لە ساڵی ٢٨٤ی کۆچی دەستی پێکردبوو، کەدەکاتە نزیکەی یەك هەزار ساڵ. بەم خێرایە، بینیمان کەمەزهەبی زەیدییەکان ڕەگ و ڕیشەی لەکۆمەڵگەی یەمەنی دا کوتاوە، بەدرێژایی ئەو ماوە دوورو درێژە، جا چ لەکاتی بەهێزی یا بێهێزی دا بێ، لەتەك ئەوانەوە دەوڵەتی سوننی و ئیسماعیلی دروستبوون، ئەگەر چی کارگەری مەزهەبی ئیسماعیلیەکان زۆر بەردەوام نەبوو، کەتەنها نزیکەی ١٣٠ لەیەمەندا مایەوە، کەبەهیچ شێوەیەك لەیەك کاتدا کۆنترۆڵی تەواوی یەمەنیان نەکردووە.

هەروەکو لەهەمانکاتدا بینیشمان کە شیعەی دوازدە ئیمامی بەهیچ شێوەیەك بوونیان لەگۆڕەپانی یەمەندا نەبووە، لێرەوە دەبینین کە زەیدیەکان لەو وڵاتەدا نزیکەی ٣٠٪ دانیشتوانی یەمەن پێکدەهێنن، لەکاتێکدا دوازدە ئیمامیەکان ڕێژیەکی زۆر زۆر کەمی کۆمەڵگەکە پێکدەهێنن، کە ئامارێکی وردیش بۆ ئەم ڕێژەیەش لەبەردەستاندا نییە. لەگەڵ ئەمەشدا ئێستا گوێبیستی کێشەی حوسیەکان دەبین لە باکووری یەمەن دا، بەتایبەتی لەهەرێمی صەعدە دا، دەشبیستین کە مەزهەبەکەیان بریتیە لە دوازدە ئیمامی، هەروەها گوێمان لە پاڵپشتی ئێران یش دەبێت بۆیان...

باشە مەزهەبی دوازدە ئیمامی لەكوێ وە هاتە ناو یەمەنەوە؟
و چۆن كێشەكە تەشەنەی كرد و كار گەیشتە ئەوەی كە جەنگەكان؟
لەنێوان حكومەتی یەمەنی و شوێنكەوتوانی حوسیەكان بەردەوام بێت؟

# چـیرۆکی حوسـییەکان

چیرۆکی حوسیەکان بووبوو بە بابەتێکی هاوبەشی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە لەماوەی ئەم پێنج ساڵەی ڕابردوودا، کەلەڕاستیدا چیرۆکەکە یەکێکە لە چیرۆکە سەرسوڕهێنەکان، کەلێکدانەوە و ڕاڤەی جیاجیای بۆدەکرێت، ڕاستیەکەی ئەم چیرۆکە لەنێوان دۆستان و نەیارانی و بەرگریکار و هێرشبەرانیدا ونبووە!

باشە حوسیەکان کێن؟ و کەی دەرکەوتن؟ ئامانجیان چییە؟ و بۆچی دژایەتی حکومەتی یەمەنی دەکەن؟ و کاریگەری هێزە دەرەکیە جیهانیەکان لەسەر ڕووداوەکانی چیرۆکەکەیان؟ ئەم پرسیارانە و چەندین پرسیاری تریش دەبنە تەوەری بابەتی ئەم ووتارەمان، کەهیوادارم ڕێگاکەمان بۆ ڕۆشن بکاتەوە لەم چیرۆکە ئاڵۆزکاوەدا.

لە بەشی پێشوودا "چیرۆکی یەمەن"، بەکورتی باسی مێژووی فەرمانڕەوایەتیمان کرد لەیەمەندا، و زانیمان کە شیعەی زەیدییەکان بۆماوەیەکی زۆر دوورو درێژ پشکێکیان لە فەرمانڕەوایەتی ئەم وڵاتە بەرکەوتبوو، کەبۆماوەی زیاتر لە چەندین سەدەی خایەند، زەیدییەکان لە فەرمانڕەوایەتی یەمەندا مانەوە تاوەکو هەڵگیرسانی

شۆڕشی یەمەنی لە ساڵی ١٩٦٢ی زاینی، هەروەها جیاوازی نێوان مەزهەبی زەیدییەکانی یەمەن و مەزهەبی دوازدە ئیمامیەکانی ئێران و عێڕاق و لوبنانمان ڕوونکردەوە، هەروەك چۆن بەشێوەیەکی دوورو درێژتر باسی دوازدە ئیمامیەکانم کرد لە بەشەکانی "ڕەچەڵەکی شیعەکان" دەستڕۆیی شیعەکان" و "ترسناکی شیعەکان" و هەڵوێستمان بەرامبەر بە شیعەکان". لەبەشی پێشوودا باسی ئەوەمان کرد کە خاڵی هاوبەشی نێوان شیعەی زەیدی و سوننەکان زۆر زیاترە لە خاڵی هاوبەشی نێوان شیعەی زەیدی و دوازدە ئیمامی، تەنانەت دوازدە ئیمامیەکان دانیشنانێن بە پێشەوایەتی زەیدی کوڕی عەلی کەدامەزرێنەری مەزهەبەکەیە، لەلایەکی تریشەوە، زەیدیەکان بڕوایان بەم هەموو لادانە زۆر و زەبەندانەی بیروباوەڕی دوازدە ئیمامیەکان نییە، هەروەها دانیشنانێن بەخودی ناوی دوازدە ئیمامەکەیان، هەروەها هاوڕاشیان نین لەسەر بێتاوان بوونی ئیمامی شیعەکان، هەروەها بڕوایان بەبیروباوەڕی توقیەش (التقیة) نییە، هەروەها باوەڕیشیان نییە بەوەی لە زۆربەی صەحابەکان هەڵگەڕابێتنەوە لە ئایینی ئیسلام، هەروەها بڕواشیان بە بەدائە(البداءە)[1] ش نییە، جنێویش بە صەحابان نادەن، هەروەها چەندین بیدعەو شتگەلی خراپ هەن کە زەیدییەکان بڕوایان پێیان نییە.

---

(١) البداءە: واتە بەدیارکەوتن، کە بریتیە لەو بیرو باوەڕەی کە شیعەی ئیمامی و جولەکەکان هەیانە کە دەڵێ: خوای گەورە (حاشا لەخودای گەورە (سبحانە وتعالی) هەڵە دەکات تا ئەوکاتەی بۆی بەدیار دەکەوێت کە هەڵە بووە دوای پەشیمان دەبێتەوە.

هەروەها ووتیشمان کە بەدرێژایی تەواوی مێژووی یەمەندا یەك دوازدە ئیمامی بوونیش نەبووە، تەنها ئەوەنەبێ کە لەم ساڵانەی دوایی نەبێ کە باردۆخەکە گۆڕاو، و ئەم گۆڕانەش پەیوەندیەکی گەورەی بە چیرۆکی حوسیەکانەوە هەیە.

## ڕەگ و ڕیشەی چیرۆکەکە

چیرۆکەکە سەرتا لە پارێزگای صەعدەوە دەستی پێکرد، کە ٢٤٠کم لە صەنعاوە دوورە، کە زۆرتر ژمارەی زەیدییەکان لەوناوچەیەدا نیشتەجێبوون، لە ساڵی ١٩٨٦ی زاینیدا "یەکێتی گەنجان" ڕاگەێنرا، کەبریتی بوو لە دەستەیەك کە ئامانجی بڵاوکردنەوەی مەزهەبی زەیدی و ناساندی بوو بەو کەسانەی کە تازە دەهاتنە سەر ئەم مەزهەبە، بەدرەدینی حوسیش کە ئەوکاتە یەکێ بوو لە گەورە زاناکانی زەیدیەکان، لەنێوان مامۆستایانی ئەم دەستەیە بوو.


بەدرەددینی حوسی

لە ساڵی ١٩٩٠ی زاینییدا یەکبوونی یەمەن ڕوویدا، دەرفەتی بۆ فرەحیزبی ڕەخساند، دوای ئەمە یەکێیەتی گەنجان بووبە حیزبی حەق، کەگوزارشتی لە چینێك لە زەیدیەك دەکرد لەیەمەندا، پاشان حوسەین بەدرەددینی حوسی بەدیارکەوت، کەکوڕی زانا بەدرەددینی حوسی بوو، وەك سەرکردیەکی

ناوداری سیاسی چوو بۆ ئەنجومەنی نوێنەران لە ساڵی ١٩٩٣و ١٩٩٧ زاینییدا.

هاوکات لەگەڵ ئەم ڕووداوانەدا، ناکۆکیەکی گەورە لەنێوان بەدرەددینی حوسی وتەواوی زانایانی زەیدییەکانی یەمەن سەبارەت بە فتوایەکی مێژووی کە زەیدیەکانی یەمەن ڕەزامەندییان لەسەری نیشان دابوو ڕوویدا، لەسەروی هەموویانەوە مەجدەددینی موئەییدی بوو، دەقی فەتوایەکەش دەگووت: مەرجی پێشەوایەتی بەوەی کە دەبێ پێشەوا لەوەچەی هاشمی بێ لە ڕۆژگاری ئەمرۆدا شتێکی قبوڵکراونیە، و ئەمە بۆ بارودۆخێکی مێژووی بووە، گەلیش بۆی هەیە کە کەسێکی شیاو بۆ فەرمانڕەوایەتی خۆی هەڵبژێرێت، با ئەو کەسەش لە نەوەو وەچەی حەسەن یان حوسەینی کوڕی ئیمامی عەلیش (رضي الله عنهم) نەبێ.

بەدرەددینی حوسی بەتوندی بەرهەڵستی ئەم فەتواییەی کرد، بەتایبەتی لەبەرئەوەی ئەو لەکۆمەڵەی جارودی (فرقة الجارودية) بوو، کەیەکێکە لە کۆمەڵەی ئەو زەیدییانەی کە بەشێوەیەکی ڕێژەیی لەڕووی بیرکردنەوەیان لە شیعەی دوازدە ئیمامیەوە نزیکن. بارودۆخەکە بەرەوپێشچوونی زیاتری بەخۆیەوە بینی سەبارەت بە بەدرەددینی حوسی، وایلێهات بەدرەددین بەڕاشکاوانە بەرگری لە مەزهەبی دوازدە ئیمامی دەکرد، تەنانەت کتابێکیشی بەناونیشانی "زەیدییە لە یەمەن" (الزيدية في اليمن) دا دانا، کەتێیدا باسی خاڵە هاوبەشەکانی نێوان زەیدی و دوازدە ئیمامی دەکات، بۆیە لەبەر بەرپەرچدانەوە بەهێزی زەیدییەکان بەدرەددین حوسی ناچاربوو،و بەرەو ئێران یەمەنی جێهێشت،

بۆ ماوەی چەندین ساڵ لە ئێران مایەوە.

سەرەڕای بەجێهێشتنی گۆڕەپانی سیاسی یەمەنی، بیرۆکەکانی بەرەددینی حوسی دوازدە ئیمامی دەستی بەبڵاوکردنەوەکرد، بەتایبەت لە هەرێمی صەعدیەوە ناوچەکانی دەوروبەریدا، ئەمەش لە کۆتایی نۆهەتەکانی سەدەی ڕابردوو بوو، بەدیاریکراوی لە ساڵی ١٩٩٧ی زایینییەوە، لەهەمان کاتدا حوسەینی کوڕی بەدرەددینی حوسی لە حیزبی حەق جیابووەوەو کۆمەڵەیەکی تایبەت بەخۆی دامەزراند، کەلەسەرتادا کۆمەڵەیەکی ڕۆشنبیری و فیکری ئاینی بوو، تەنانەت هاریکاری حکومەتی دەکرد بۆ بەرپەچدانەوی هەڵکشانی سوننەکان کەلە(کۆمەڵەی یەمەنی بۆ چاکسازی) خۆیان دەنواند، بەڵام هەندەی پێنەچوو، کۆمەڵەکەی حوسەینی حوسی ئاڕاستەیەکی نەیار (ئۆپۆزیسیۆن) بوونی دژ بە حکومەوت وەرگرت لەسەرەتای ساڵی ٢٠٠٢ی زاینی.

لەم کاتەدا هەندێ لە زانایانی یەمەن چوونەلای عەلی عبدالله صالحی سەرۆکی یەمەن و تکایان لێیکرد کە ڕێگەبدات بەوەی بەرەددینی حوسی بگەڕێتەوە بۆ یەمەن، سەرۆکی یەمەنیش ڕەزامەندی نیشاندا لەسەر تکاکەیان، و بەدرەددینی حوسی گەڕایەوە بۆ یەمەن بۆ ئەوەی سەرلەنوێ قوتابی موریدەکانی بەبیرۆکەکانی خۆی جۆشبدات. روون ئاشکرابوو کەحکومەتی یەمەنی گرنگییەکی ئەووتۆیی بەم کۆمەڵەیە نەدەدا، پێشی وانەبوو کەکێشەیەکی ئەوتۆیی لەدواوە بێت.

## خۆپیشاندانە گەورەکەی حوسی یەکان و سەرەتای جەنگەکە

لەساڵی ٢٠٠٤ی زاینیدا پێشکەووتنێکی مەترسیدار ڕوویدا، کاتێك حوسەینی کوڕی بەدرەددینی حوسی هەڵسا بەئەنجامندانی خۆپیشاندانی زۆر گەورە لە ناوشەقامەکانی یەمەن دا، لەدژی داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئەمریکاوە، حکومەتیش بەتوندی ڕووبەڕووی ئەم خۆپیشاندانانەوە بووەوە، وڕایگەیاند کە حوسی داوای ئیمامەتی و پێشەوایەتی وبانهێشەی مەهدی بوونی خۆیی،و تەنانەت بانگهێشتەی پێغەمبەرایەتیشی دەکرد، ئەمەش وایکرد حکومەتی یەمەنی جەنگێکی ئاشکرای لەدژی حوسییە شیعەکان ڕاگەیاند، کەتێدا زیاتر لە ٣٠ هەزار سەربازی بەکارهێنا، هەروەها فرۆکەو تانکت و تۆپی تیدا بەکارهێنا، ئەم بەرەنگاربوونەوەش کوشتنی حوسەین حوسی سەرکردەی ڕێکخراوەکەی، بەدیلگیرانی سەدان ودەستکەوتنی ژمارەیەکی زۆر لە چەك و تفاقی حوسییەکانی لێکەوتەوە.

بارودۆخەکە بەتەواوی بارگرژی لێکەوتەوە، دوای کوژرانی حوسەین حوسی، بەدرەددین حوسی باوکی بوو بە سەرکردەیی حوسییەکان، و ڕوونی کردەوە کە کۆمەڵەکە بەنهێنی پێشتر خۆیی خۆیی بەشێوەیەکی زۆرباش پڕچەککردبوو؛ بۆیە توانی کە ڕووبەرووی سوپای



یەمەنی ببێتەوە لە ماوەی ئەم چەند ساڵەدا.

وولاتی قەتەڕ هەڵسا بە ناوبژیکردنی نێوان حوسییەکان و حکومەتی یەمەنی لە ساڵی ٢٠٠٨ی زاینیدا، لەئەنجامی ئەمەدا ڕێکەوتننامەیەکی ئاشتی لێکەوتەوە کە لە ئەنجامدا یەحیایی حوسی و عەبدولکەریمی حوسی کەبرای حوسەینی کوڕی یەدرەددینی حوسی بوون چوونە قەتەر و بەوەی چەککەکانیان بدەنەوە حکومەتی یەمەن، بەڵام ئەم ڕێکەوتنامەیە هەندەی نەخایاند هەڵوەشایەوە، و شەڕ سەر لەنوێ دەستی پێکردەوە، و تەنانەت بەدیارکەوت کە دەسەڵاتی حوسییەکان لە پارێزگەکانی دەوروبەری صەعدە لە فراوانبوون دایە، تەنانەت هەوڵیان دەدا بگەنبە کەناری دەریایی سووربەمەبەستی دەستبەسەراگرتنی دەریایی لە یەکێ لە بەندەرەکان (میناکان) تاوەکو هاتنی کۆمەك و هاریکاریەکانیان لەدەرەوەی یەمەن مسۆگەر بکەن.

بێگومان ئێستا بانگەوازیکردنەکە ڕوون ئاشکرابووە، هەروەها ڕووبەڕووبوونەوەکەش ڕاشکاوانەیە، تەنانەت قسەکانیان بریتیە لەهەڕەشەکردن لەتەواوی سەرکردایەتی یەمەنی، نەك تەنها جیابوونەوەی بەشی شیعی لە دەوڵەتی یەمەنیدا.

## هۆکاری بەهێزی حوسییەکان

بۆ تێگەیشتن لەم مەسەلەیە چەند هۆکارێك هەن کەیارمەتیمان دەدەن لە ڕۆشنکردنەوەی ڕێگەی تێگەشتنمان لە بابەتەکە، لەوانەیە گرنگترین ئەمانەی خوارەوە بن:

**یــەکــەم:**

ناکرێت بڕوابکرێت کە کۆمەڵەیەکی بچووك لە یەکێ لە پارێزگە بچووکوکانی یەمەندا بەم شێوەیە و بۆ ئەم ماوەدرێژە خۆڕابگرن و هیچ هاریکارێکی بەردەوامی دەرەکیشیان بۆ نەهاتبێت، و کاتێك شیکار بۆ ئەم بارودۆخە ئەنجام دەدەین دەبینین کە تەنها دەوڵەت کە قازانج لە زیادبوونی هێزی تێکدەری حوسییەکان دەکات بریتیە لە دەوڵەتی ئێران، کە دەوڵەتێکی دوازدە ئیمامییە، و بەهەموو توانا وهۆکارێك هەوڵی بڵاوکردنەوەی مەزهەبەکەی دەدات، ئەگەر توانیشی بزوتنەوەی حوسییەکان هان بدات بەرەو دەستگرتن بەسەر فەرمانڕەوایەتی یەمەن، ئەمە دەبێتە سەرکەوتنێکی زۆر گەورە بۆ ئێران، بەتایبەت بەهۆی ئەوەوە ئەو دەورەی یەکێ لە بەندەرە ئاوییە گەورەکان دەدات کە ئەویش بریتییە لە وڵاتی سعودیە،



سعودییەش لەلای باکورییەوە بە عێراق و لەلای ڕۆژهەڵاتی بە کوێت و بەحرێن و لە باشوورەکەشی بە یەمەن دەورە دراوە، ئەمەش کارتێکی فشاری بەهێز دەداتە دەستی ئێران، هەردوو لایەنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ جیهانی سوننی و هەروەها لەگەڵ ئەمریکاشدا.

ئەم گریمانەیەش شتێکی هەروەها تیۆری و نەزەری نییە، بەڵکو ڕاستیە و چەندین بەڵگەی زۆری لەسەر هەیە، لەوانە ئەو گۆڕانە خێرایەی بیرو باوەڕی بەرەدینی حوسی یە لە بیروباوەڕی زەیدی میانە ڕەو بۆ بیروباوەڕی لاور و لەوێری دوازدە ئیمامی، لەگەڵ ئەوەی ژینگەی یەمەنی بەدرێژایی مێژووی خۆی ئەم جۆرە بیروباوەڕەی تیدانەبووە، تەنانەت بەرەدیینی حوسی بەتوندی لەباوەشی خۆی گرتبووە بەڵکو لەتەهران بۆ ماوەی چەند ساڵێك مێوانداریيەکی باشی کردبوو، هەروەها بەدرەدینی حوسی بیرۆکەی ویلایەتی فەقیهی پێباش بوو، کەپێشتر خومەینی گەیاندە دەسەڵات، ئەگەرچی لە وەچەو نەسلی فاتیە (رضي الله عنهم)ش نەبێ، ئەم بیروباوەڕەش لە مەزهەبی زەیدیەکاندا بوونی نییە، بەهەمان شێوە ئێرانیش وولاتیکی بەهێزە دەتوانێ هاریکاری سیاسی و ئابووری و سەربازی گێرەشێوێنەکان بکات، لەڕاستیدا ژمارەیەك لە هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی ئێرانی شیعی جەختیان لەسەر هاریکاری ئێرانی بۆ حوسییەکان کردۆتەوە، بۆنموونە هەردوو کەناڵی ئاسمانی "العالم" و "الکوثر" کەهەردوو کیان زمانحاڵی حکومەتی ئێرانن.

بەهەمان شێوە، پێشتر حوسیەکان خۆیان داواییان کرد بوو کە ئایەتوڵڵا سیستانی گەورە مەرجەعی باڵای شیعی عێراقی ناوبژیوانیان

بکات، سیستانیش کەسێکی دوازدە ئیمامییە، بۆیە خەڵکی یەمەن لایان سەیربوو، بەڵام ئەمە جەختی لەسەر ئاژاوەگێڕی مەزهەبی ئەوان دەکردەوە، سەرەڕای ئەمەش حکومەتی یەمەنی کە دەستیان گرتووە بەسەر چەند پارچە چەکێکی زۆری تایبەت بەحوسییەکان کە دروستکراوی وولاتی ئێران بوون. حکومەتی یەمەنیش بە ئاماژەی ناڕاستەوخۆ ئەمەی دەردرکاند، بەڵام بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ نەبوو، کە ئێران هاریکاری حوسییەکان دەکات، ئێرانیش وەکو سروشتی خۆی ئەمەی ڕەتدەکردەوە، ئەمەش یارییەکی سیاسی ڕوون و ئاشکرا بوو، بە تایبەت لەژێر ڕۆشنایی بیروباوەڕی توقییەی دوازدە ئیمامی، کە درۆکردن بەبێ سنووری بۆ کەسانی ناو مەزهەبەکەی بە جائیز و ڕەوا دەزانێ.

**دووەم:**

یەکێکی تر لەو هۆکارانەی کە یارمەتیدەری بەردەوامی بزوتنەوەی حوسییەکانی یەمەن بوو بریتی بوو لە سۆزداری کۆمەڵگەی سوننی دانیشتوانی ناوچە ئەو بزوتنەوەیە بوو، تەنانەت ئەگەر بیروباوەڕیشی وەکو ئەو بیرو باوەڕە لارولەوێرەی ئەوانیش نەبووبێ، ئەمەش بەهۆی زۆرخراپی بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی ناوەچەکەوە بوو، لەڕاستیدا وولاتی یەمەن بەدەست بێهێزی ژێرخانی ئابووری یەوە دەیناناڵاند، فەقیری و هەژاری بەردەوام زۆربەی دانیشتوانی گرتۆتەوە، بەڵام پێدەچوو ئەو ناوچانە زیاتر لەناوچەکانی تر بەدەست ئەم کێشانەوە دەیاننالاند، گرنگی دانێکی ئەووتۆ نەدەدەرا بەم ناوچانە کە هاوشێوەی



شارەگەورەکانی تری یەمەنی بێت، ڕێکەوتننامەکەی ئاشتی نێوان حکومەتی یەمەنی و حوسییەکان بەناوبژیوانی حکومەتی قەتەر لە ساڵی ٢٠٠٨ی زاینی یش جەخت لەسەر ئەوە ڕاستیە دەکاتەوە، کە دەقی ڕێکەوتننامەکە دەیگوت پێویستە کە حکومەتی یەمەنی هەڵسێ بە دارێشتنی پلانی دووبارە نۆژەنکردنەوەی ناوژەی صەعدە، و وولاتی قەتەریش پرۆژەکانی نۆژەنکردنەوە پارەدار دەکات، بەلام تەواوی ئەمانە بەهۆی بەردەوامی شەڕوئاشووبەوە پەکیانکەوت، بەلام مەبەستمان لەم هەڵوێستە بریتیە لەوەی کە ئەو گەلانەی کە ژیانێکی ئەووتۆ دەبەنە سەر کەتێدا پشتگوێخراوون، لەکاردانەوەی ئەمە نارەزایی و راپەرینی تێدا دروستدەبێت، تەنانەت ئەگەر بێتوو شان بەشانی کەسانێکیش بێ کە لە بیروباوەر و پرەنسیپەکانیشیان دا یەك نەگرنەوە.

سـێیەم:

هەلومەرجی خیلەکیش هاریکاربوو بۆ بەردەوام بوونی یاخی بوونەکە، ئەو بارودۆخە خێلەکیەی کە باڵی کێشاوە بەسەر یەمەندا؛ یەمەن خۆی بریتیە لە چەند و هۆز و خێلێك، چەند هاوسەنگیەکی گرنگیش لەنێوان هۆزەجیاجیاکانی دا هەیە، سەرچاوەی زۆریش ئاماژە بەوە دەکەن کە حوسییە یاخیبووەکان هاریکاری و پاڵپشتی لە

هۆزە ئۆپۆزیسیۆنەکانی حکومەتی یەمەنی وەردەگرن، ئۆپۆزیسیۆنی بوونی ئەم هۆزانەش بەهۆی ئەو ڕوداوانەی نێوان ئەوان و حکومەتی یەمەنی یەوە بووە، بەبێ گوێدانە جیاوازی ئاینی و مەزهەبی.

چـــوارەم:

یەکێکی تر لەوهۆکارانەی یاریدەدەر بوو لە بەهێزبوونی حوسییەکان بریتی بوو لە سروشتی شاخاوی یەمەن کەوا دەکات کۆنترۆڵکردنی لەلایەن سەربازانی حکومەتی یەمەنی یەوە ئەستەم بێت، ئەمەش بەهۆی نەتوانی جوڵەکردنی سەربازەکان، و لەبەر بوونی حەشارگە و ئەشکەوتی زۆر، و نەبوونی توێژینەوەی زانستی وورد کە ڕێگەکانی هاتوو چۆی ناو ئەم چیایانە ڕوونبکاتەوە، هەروەها هیچ ئامێرو ئامرازێکی زانستی و مانگی دەستکردی ئەووتۆ لەبەردەستدانی کە نیشانە و ڕەصەدی تەواو لەم بزوتنەوەیە بدات.

پێنجـــەم:

یەکێکی تر لە هۆکارەکانی بەردەوام بوونی کێشەکان بریتی بوو لەسەر قاڵی حکومەتی یەمەنی بە مەسەلەی داواکردنی جیابوونەوەی یەمەنی باشوور لە یەمەنی باکوور، و ئەنجامدانی خۆپیشاندان بەو مەبەستە و بەدیارکەوتنی ((عەلی سامی بەیز))ی سەرۆکی پێشووی یەمەنی باشوور، کە دانیشتووی وولاتی ئەڵمانیا بوو، و داوای جیابوونەوەوەی دەکرد. بێگومان ئەم کارەش حکومەتی یەمەنی و سوپاکەی و هەواڵگرییەکەشی توشی پەرتەوازەیی کرد، بەمەش دەسەڵاتیان لەبەرامبەر حوسییەکان لاواز بوو.

شــەشــەم:

هەندێ شیکردنەوە و شرۆڤە هەن کە دەڵێن: حکومەتی یەمەنی خۆی دەیەوێت کەئەم یاخی بوونەی حوسییەکان بەر دەوامی هەبێت! هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە بوونی ئەم یاخی بوونە وادەکات کە حکومەتی یەمەنی وەکو کارتێکی پاڵەپەستۆی بەهێز لەدەستی خۆیدا دەهێڵێتەوە و دەستکەوتی نێودەوڵەتی پێبەدەست دەهێنێت، گرنگترین دەستکەوتیش بریتییە لە هاریکاری ئەمریکی لەوەی کە بەجەنگی



خۆپێشاندان بۆ داواکردنی جیابوونەوەی باشووری یەمەن

دژی تیرۆر ناسراوە، و لەبەر ئەوەش ئەمریکاش ئاماژە بە بوونی پەیوەندی نێوان ڕێکخراوی قاعیدەوە حوسییەکان دەکات. من خودی خۆم ئەم ئەگەر زۆر بە دوور دەزانم؛ چونکە ئەو ڕێبازەی ڕێکخراوی قاعیدە لەسەری دەڕوات تەواو تەواو لە ڕێبازەکانی دوازدە ئیمامییەکانەوە جیاوازە، سەرەڕای ئەمە ئەمریکا دەیەوێت دەستی خۆی لە هەموو

لایەکی جیهانی ئیسلامی وەربدات، بۆ ئەم مەبەستەش برویبانووی جیاجیا دەهێنێتەوە، یەمەنیش دەوێت کەڵك لەم پەیوەندیەی وەرگرێت لەرووی هاریکاری سیاسی و ئابوورییەوە، یان تەنانەت لەیادبردنەوەی مەسەلەی کردنەوەی مەلەفی مافی مرۆڤ و دیکتاتۆریەت، یان مەلەف گەڵکی تر کە ڕۆژئاوا هەوڵی کردنەوەیان دەدات.

یەکێکی تر لە قازانجەکانی یەمەن لەبەرامبەر پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکادا بریتییە لەوەی کە قازانج لە پەوەندیەکەشی لەگەڵ سعودیادا دەکات، چونکە سعودیە هەوڵدەدات پاڵپشتی یەمەن بکات لەڕووی سیاسی و سەربازی و ئابووری یەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی پرۆژەی حوسییە شیعەکان، بەردەوام بوونی کێشەکانیش دەبێتە مایەی دەستەبەرکردنی پاڵپشتیەکی بەردەوام بۆ یەمەن، و لەوانەشە ئەم پاڵپشتیکردنەش بەسعودیەوەو نەوەستێت، بەڵکو قەتەر و ئیمارات وولاتانی تریش بگرێتەوە.

بەچاوپۆشی کردن لە هۆکارەکان دەبینین کە کێشەکە هەربەردەوامە، بەتێڕوانینی من، بارودۆخەکەش زۆر ترسناکە، بۆیە پێویستە یەمەن هەڵویستێکی جدی لەهەمبەر ئەم کێشەیە وەربگرێت، و پێویستە لەسەری کە بیروباوەڕی ئیسلامی ڕاست و دروست بڵاوبکاتەوە، تاوەکو ڕووبەڕووی ئەم بیروباوەڕە لارولەوێرانە ببێتەوە، و گرنگیەکی باش بە دانیشتوانی ئەوناوچانە بدات، تاوەکو سۆز و خۆشەویستی سروشتیان بۆ یەمەن و حکومەتەکەیان هەبێ، هەروەها لەسەر جیهانی ئیسلامیش پێویستە شان بەشانی حکومەتی یەمەنی لەرامبەر ئەم قەیرانە ڕاوەستن، ئەگینا پرۆژەی شیعەکان هەموو، کونکوچێکی

جیهانی ئیسلامی دەگرێتەوە، لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە گەلی یەمەنی چاوێ حیساباتەکانی خۆییدا بخشێنێتەوەو بەرژەوەندی یەمەن بێنێتە بەر چاویان، ئەم بەرژەوندیە دەخوازێت کەئەوان یەکبگرن، و بیروباوەڕی ساغ و سەلیمیان هەبێ، و دەخوازێ کەهەموویان لەسەر پەرتووکی خودای گەورەو سوننەتی پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) کۆببنەوە، ئەو ئێمە لەو قەیرانەمان ڕزگارمان دەبێت و ئارام دەگرین لەسەر چارەسەرکردنی کێشەکانمان.

# ئایا کێ فەرمانڕەوایەتی ئێران دەکات؟

زۆرێك لە مسوڵمانان سەرسامن بەبینینی هەڵبژاردنە سەرۆکایەتیەکەی ئێران، بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمار، و پێانوایە کە شتێکی شارستانیە کە سەرکردیەك لەلایەن گەلەوە بەمەبەستی ڕازیکردنی گەل و جێبەجێکردنی هیوا و ئاواتەکانیان هەڵدەبژێردرێت، بەتایبەت لەو بارودۆخە پڕ دڵەڕاوکێیەی کەلەزۆربەی وولاتانی جیهانی عەرەبی گرتۆتەوە،چونکە لەو وولاتانە کۆمەڵە سەرکردو پادشایەیەك جڵەوی دەسەلاتیان گرتۆتە دەستی کە بەویستی گەل هاتوونەتنە سەر دەسەلات، تەنانەت ئەگەر بێت و هەڵبژاردنیش لەو وولاتە عەرەبیانە ئەنجام بدرێت ئەوا هەڵبژاردنێکی ساختە و مزەوەر دەبێت، ئەمەش وایکردووە مسوڵمان تامەزۆر و حەودالی هەر کارێگەلێکی هاوشێوەی ئەمە بن بەبێ ڕەچاو کردنی ئەوەی کە ئەمە هی ڕۆژئاوا یاخود هی شیعەکان یان هی هەر کەسێکی ترە بێت.

بەڵام ئاخۆ دەکرێت هەڵبژاردنە ئێرانیەکان بەکردارەکی وەکو نمونەیەك سەیربکرێت و چاویان لیبکرێت؟ ئایا ئەو سەرۆکەی کە گەلی ئێرانی هەڵیدەبژێت ئەو دەسەلاتەی پێدەدرێت کە ئاواتەکانی



موحەممەد ڕەزا پەهلەوی، شای ئێران

دەنگپێدەرانی پێنێتەدی؟ ئایە هەڵی چاکسازی هەیە دوای ئەوەی گەندەڵی پەیدابوو؟ ئایا ڕژێمی ئێرانی بە شێوەیە چالاکە ئەوکەسانەی کە سەرسامن بە شیعەکان دەیلێن؟!

بێگومان پێویستە بگەڕێینەوە بۆ بنەماکان، بۆ ئەوەی لەوە تێبگەیین کە لە ڕاستیدا کێ فەرمانڕەوایەتی ئێران دەکات. بۆیە پێشنیاری ئەوە بۆ خوێنەران دەکەم کە سەبارەت بەم بابەتە بەشەکانی "ڕەچەڵکی شیعەکان" و "دەستڕۆیی شیعەکان" و "مەترسی شیعەکان" و "هەڵوێستمان بەرامبەر بەشیعەکان" بخوێننەوە، چونکە بەخوێندنەوەیان تێڕوانینێکی ڕوونتر لایان دروست دەبێت.

## دیکتاتۆریەتی خومەینی

لەساڵی ١٩٧٩ی زایینی دا خومەینی شۆڕشی بەرپاکرد و ڕژێمی دیکاتۆری پێشووی ئێرانی بەسەرکردایەتی شا پەهلەوی لەناوبرد، کە ئەو کات خومەینی لە ئێران دەسەڵاتێکی زۆری هەبوو، سەرەڕای ئەو دەسەڵاتەی کە ڕژێمەکەی ئەو هەیبوو، بزانین خومەینی چی ئەنجامدا؟ لەڕاستیدا خومەینی دیکتاتۆرییەتێکی دروستکرد، کە زۆر لە دیکتاتۆرییەتی شاه گەورەتر بوو، دەسەڵاتەکەی سەرووی

تەواوی دەسەڵاتەکانی شاه بوو، ئەگەر هەلی تانەدان و ناڕەزایی دەربڕین لەسەردەمی شاه دا هەبووبێ ئەوا لەسەردەمی خومەینی و دوایی خومەینی بوونی نەما. بەڵام هەرچی ئەوەی ئەمڕۆ دەیبینین لەململانێ و ناڕەزای و سەربازگە شتێك نییە جگە لە شتێکی سنووورداری چاك کە ئامانجی کۆتاییشی بریتیە لە جوانکردنی ڕژێمەکە، و خۆڵکردنی چاوی هەمووو لایەك کە گوایە سەربەستی و ئازادی لەئێراندا بوونی هەیە، و وولاتی ئێران حال و گوزەرانی باشە، و هەڵبژاردنی گەل ڕیزدارە!

## چۆن ئەمە ڕوویدا؟! و چیرۆکەکەی چییە؟

لەڕاستیدا خومەینی جڵەوی دەسەڵاتی ئێرانی وەرگرت بەپێ بیردۆزێك کەخۆیی لەمێژووی شیعەدا دەریهێنا بوو، ئەویش بە بیردۆزی "ویلایة الفقیة" ( واتا: فەرمانڕەوایەتی شەرعزان) ناسرابوو، لەبنەرەتدا لەبیروهیزری شیعەکاندا دەبێ فەرمانڕەوایەتی بۆ پێشەوای بێتاوان بێت، و شیعەکان بڕوایان بە بێتاوان بوونی پێشەوا عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب (رضي الله عنه)، و پاشانیش بێ تاوانی ڕۆڵەکانی کە حەسەن و حوسەین ن(رضي الله عنهم) پاشانیش کوڕەکانی حوسەین بەریز، ئەوانەی کە لای شیعەکان بە دوازدە ئیمامەکان ناسراون، بەڵام ئەوە بوو کە ئیمام عەسکەری، کە ئیمامی یازدەمی شیعەکانە، لەساڵی ٢٦٠ ی کۆچییدا وەفاتیکرد، بێئەوەی هیچ ئیمامێکی تری بێگوناح لەدوای خۆییدا دابنێت.

بۆ چارەسەركردنی ئەم قەیرانە، شیعەكان بوونە چەند تاقم و گرۆیەك، یەكێ لەم تاقم و گرۆیانە بریتی بوو لە دوازدە ئیمامیەكان، كە پێیان وایە گوایە ئیمامی عەسكەری وەسیەتی كردووە بە كوڕە گچكەكەی خۆیی كردووە كاتێ تەمەنی نەیگەیشتبووە پێنج ساڵیش، ئەوەبوو، ئەم ئیمامی دوازدەمە دەچێتە ژێرزەمینێكەوە و بزردەبێ. شیعە دوازدە ئیمامیەكانی ئێران و لوبنان باوەڕیان وایەكە ئیمامی دوازدەم هێشتا هەر لەژێرزەمیینەكە دایە، ڕۆژێك دادێت دێتە دەرەوەو فەرمانڕەوایەتی هەموو جیهان دەكات، كەئەمە لای ئەوان بە مەهدی چاوەڕوانكراو (المهدی المنتظر) ناسراوە،لەبیروباوەڕی شیعەكانە كە جائیزنییە كە كەسێ فەرمانڕەوایەتی و سەركدایەتێكی بگرێت ئەستۆیی و ئەحكامی دینی و جیهاد و كۆمەڵە و جێبەجێكردنی حەددەكان و هەموو هەرشتێكی تر لە ئامادەكی پێشەوای بێتاوان (الإمام المعصوم)، بۆیە هەموو شتێك لەكاردەوێ تاوەكو ئەم ئیمامە وەهمیە دەردەچێت.

## فەرمانڕەوایەتی شەرعزان (ویلایة الفقیه)

بەڵام هەرچی خومەینی یە بیردۆزێكی ئیجتیهادی ناو مێژوویی شیعەكانی زیندووكردەوە كە بریتیە لە فەرمانڕەوایەتی شەرعزان (ویلایە الفقیە)، بەواتایەی كە ئیمامی مەهدی (ئەو منداڵەی چۆتە ناو زێرزەمینەكە) پەیمانی داوەتە ئەو شەرعزانە بەتوانایەی كە بەتەواوی بەو كار و ئەركانە هەڵسێ كە ئیمامی مەعصوم لەكاتی ئامادەیی و وجودی خۆیدا پێیانهەڵدەستێت، و ئەم شەرعزانە پێشەوایەتی تەواوی

ئومەتیش دەکات، تەنانەت بەوەی کە کەئەویش مەعصوم و پارێزراو دەبێت لەتاوان، و تەنانەت سروش و نیگای لەلای خوداشەوە بۆدێت، و تەنانەت پلەوپایەشی دەگاتە سەروی پلەوپایەی پێغەمبەرایەتیشەوە، چونکە لای ئەوان پێغەمبەرایەتی لەماوەیەتی دیاریکراودا کۆتایی پێهاتووە، لەکاتێکدا پێشەواوی مەعصوم تاوەکو ئێستاش بەردەوامی هەیە، لەپێشردا قسەی خومەینی مان خستەڕوو کەلە پەرتووکی (الحكومة الإسلامية) دا دەڵێ: ((...لە بنەما سەرەکییەکانی مەزهەبی ئێمە ئەوەیە کە ئیمامەکانمان پلەوپایەکی ئەوتۆیان هەیە نەهیچ فریشتەیەکی لە خوا نزیك، نەهیچ پێغەمبەرێك نایگاتێ))[١].

لەسەربنەمای ئەمەوە، ئەگەرهاتووە ئێرانیەکان رەخنەشیان دەربارەی ئەم بیردۆزەش هەبێ، لەبنەرەتیشدا بۆیان نیە ڕەخنەش لە بڕیاروحوکمەکانی ئەو شەرعزانە هەبێ کە ڕابەرایەتی و سەرکردایەتی وڵاتی گرتۆتە دەستی، ئەوکەسەی کە بە گەورەترین شەرعزان (الفقه الأكبر) یان رابەری شۆرش، یان سەرکردە ناسراوە، ئەمانە تەواوی ئەو ووشە هاواتایانەن کە بۆ کەسەلایەتی یەکەمین و دواهەمین ی ڕژێمی ئێرانی تازەدا بەکاردەهێنرێن، ئەمەش زۆر زۆر ترسناکە، تەنانەت ئەم بارودۆخە زۆر لەبارودۆخی ڕژێمە عەربیە گەندەڵەکان خراپترە، چونکە فەرمانڕەوایانی عەرەبی دیکتاتۆر ناڵێن کە بەناوی خودای گەورەوە (عز وجل) فەرمانڕەوایەتی دەکەن، بانگهێشتەی نیگاو ئیلهامیش ناکەن لەلایەن خودای گەورەوە، و ناشڵێن ئەوان مەعصومن، و گەلەکانیشیان پێیان وانیە کە گوێڕایەڵیکردنی ئەوان کارێکە کە شەرعی ئیسلام

---

(١) خومەيني: الحكومة الاسلامية: لاپەرە ٥٢.

تەمەنی ئەوان درێژدەکاتەوە، بەڵکو زۆربەی گەلەکانیان پێیانوایە کەبەرگریکردنی دیکتاتۆریەتیان بریتیە لە کارێکی چاك؛ چونکە بەرگریکردنە لە ستەم و خۆسەپاندن، لەکاتێکدا لەووڵاتی ئێراندا ئەم کارە بەتاوانێکی دژ بەخودا دەژمێردرێت، پێش ئەوەی بەتاوانێکی دژبە ڕژێم یان سەرکردە بێت.

بێگومان خومەینی دەستوری تازەی ئێرانی بەو شێوەیە دارێشتووە کە ئەم دیکاتۆریەتە توندرەوە بپارێزێت بۆ ئەو و ئەوانەی دوای ئەویش کەدێن کە پەیڕەوی ڕێبازی دوازدە ئیمامی لارولەوێر دەکەن، یەکێ لە ماددەکانی دەستوری کرد بەوەی کە ڕابەری شۆرش بەدرێژایی تەمەنی لەم پۆستە دەمێنێتەوە!

پاشان خومەینی هەڵسا بەدامەزراندنی ئەنجوومەنی شارەزایان (مجلس الخبراء)، ئەم ئەنجومەنە لەلایەن خەڵکی یەوە هەڵدەبژێردرێت، بەڵام مەرجە کە ئەندامی ئەنجومەنی شارزایان لە شەرعزایان بێت، پێویستیشە کە لە دوازدە ئیمامیەکان بێت، و باوەڕیشی بیردۆزی فەرمانڕەوایەتی شەرعزانیش هەبێت. هەروەها هەر ئەم ئەنجومەنەش فەرمانڕەوای شەرعزان دوای مردنی خومەینی وەکو جێگرەوەی خومەینی هەڵدەبژێرێت، تاوەکو بەدرێژایی تەمەنی وەکو فەرمانڕەوای شەرعزان بمێنێتەوە دوای ئەمە، ئەم ئەنجومەنە ئایەتوڵڵا عەلی خامەنەیی وەکو ڕابەری شۆڕشی هەڵبژارد، ئەو لەساڵی ١٩٨٩ ی زایینی یەوە تاوەکو ئێستا بەردەوامە، و هەرئەویش سەرکردایەتی هێزەچەکدارەکان دەکات، هەرئەویش دەسەڵاتی دانان و لادانی سەرۆکی فەرمانگە و ئەنجومەنە سەرەکیەکانی ناو ووڵاتی هەیە، هەر ئەویش سەرۆکی

دەسەڵاتی بڕیاردان و سەرۆکی ئیزاعەی رادیۆیی و تەلەفیزیۆنی و سەرۆکی ئەرکانی هیزە هاوبەشەکانی سوپا دیاریدەکات لاشیان دەدات، سەرووبی ئەمانەش، لادانی سەرۆك کۆماری هەڵبژێردراو لەلایەن گەلەوە هەردەسەڵاتی ئەودایە!!!

ئەمە جۆرە دیکاتۆریەتێکە کە هیچ دیکتاتۆرێکی عەرەبی هەر خەونیشی پێوەنابینێ، تەنها بەمەش کۆتایی نایەت، بەڵکو تەواوی ئەو شتانەی باسمانکرد بەڕاسپاردەی ئیمام مەهدی نادیارو غائیبەوە دەبێت، ئەگەر بێت و خوانەخواستا ئەوە ڕوویدات کە کەسێ سەرپێچی فەرمانەکانی ئەم ڕابەرە بکات ئەوا ئەم تاوانە دەگاتە پلەی ئەنجامدانی هاوبەشی دانان بۆخودای گەورە، چونکە ئەو کەسە تانەوتەشەنی لەکەسێکی مەعصوم گرتووە، بۆ ئەمەش پشتیان بە ووتەیەك بەستووە کە بە درۆ دەیدەنە پاڵ ئیمام جەعفەری صادیق، کەدەڵێ: ((... ئەگەر هاتوو فەرمانڕەوای شەرعزان بەبڕیاری ئێمە بڕیاریدا، بەڵام هەرکەسێك پێی ڕازی نەبوو، ئەوا ئەوکەسە بڕیاری خودای گەورەی بێنرخ داناوە، و بڕیارەکەی بەسەرماندا داوەتەوە، بۆیە ئەوکەسەی بڕیامان بەسەردابداتەوە، ئەوا بڕیاری بەسەرخودای گەورەدا داوەتەوە، ئەو دەگاتە حەددی قەراردانی شیرکە بۆ خودای گەورە))[١].

بەڵام خومەینی ویستی وێنەکە برازێنێتەوە، ئەم پۆستەی بەشێوەیەکی دیکتاتۆری نیشان نەدا، بەڵکو پۆستی "سەرۆك کۆمار"ی دانا، هەرچەندە سەرکردەیی کردارەکی وولات بریتی بوو

---

(١) کولەینی: "الاصول من الکافي" بەرگی یەکەم لاپەرە ٦٧.

لە سەرۆك یان ڕابەری شۆڕش، ئەم سەرۆك کۆمارەشی دانا بەوەی لەلایەن تاکەکانی گەلەوە بەشێوەیەکی ئاشکرا هەڵبژێردرێت، ئەمەش بۆ ئەوە بوو تاوەکو گوڕوتینی ناو کۆمەڵگە دابمرکێنێتەوە، و هەست بکات کە ئەو وەکو تاك سەرۆك کۆماری هەڵبژاردووە،و هەرئەویش کە ئاڕاستەی ڕێڕەوی گەل دەکات، باشە با کەمێك لەسەر سەرۆك کۆماری ئێران بدوێین.

## چۆن ئەم سەرۆکە هەڵدەبژێردرێت؟

خومەینی ئەنجومەنێکی داهێنا و ناوینا ((ئەنجومەنی پاراستنی دەستور)) ئەرکی ئەم ئەنجومەنە بریتیە لە هەڵبژاردنی ئەوکەسەی کە ئەکرێت ببێتە کاندید بۆ پۆستی سەرۆك کۆمار، ئەم ئەنجومەنە لە دوازدە کەس پێکدێت، شەش لە ئەندامانە ڕاستەوخۆ لەلایەتن ڕابەری گشتییەوە هەڵدەبژێردرێن! بەڵام هەرچ شەشەکەی ترن، ئەوان لەلایەن سەرۆکی دەسەڵاتی بڕیاردان، دوای کاندیکردنیان لەلایەن ئەنجومەنی نوێنەرانەوە، هەڵدەبژێردرێن، بۆ زانیاریتان، سەرۆکی دەسەڵاتی بڕیاردان خۆی لەلایەن رابەری شۆڕشەوە هەڵدەبژێردرێت، ئەمەش واتایی ئەوەدەگەێنێت، تەواوی ئەندامانی ئەنجومەنی پاراستنی دەستور ئەوانەن کە ڕابەری شۆڕش هەڵیان دەبژێرێت یاخود لێیان ڕازییە، ئەم ئەنجومەنە هەڵدەستێت بە وەرگرتنی کاندیدەکان بۆ پۆستی سەرۆك کۆمار، پاشانیش ئەم ئەنجومەنە تەنها داوای ئەو کاندیدانە وەردەگرێت کە پەوەیندیەکی زۆر باش و دۆستانەیان لەگەڵ ڕابەری شۆڕش دا هەیە!!

هیچ ئەگەرێك بۆ بوونی نەیار یان ئۆپۆزیسیۆنێك لەبەر ڕابەری شۆڕش دا نییە، ئەوە کۆمەڵەیەی کە پێیان دەڵێن پارێزکاران یان چاکسازان شتێك نین جگە لە نیشاندانی وێنەیەکی وەهمی و خەیاڵی بۆ هەندێ جیاوازی کەم لەو چوارچێوەی کە ڕابەری شۆڕش ڕێگەی پێداوە، ئەوەندە بەسە کە بزانین کە لەم هەڵبژاردنەی ئەم دواییانەدا ٤٧١ کاندید داوای خۆیان بۆ پۆستی سەرۆك کۆمار پێشکەشکرد، بەڵام ئەنجومەنی پاراستنی دەستور تەنها داوای چوار کەسیان قەبولکرد، دوو لە پارێزکاران و دووش لە چاکسازان، ئەگەر چی سەرجەمیان لە ڕۆڵەی ئەم ڕژێمە و شوێنکەوتەی ڕابەری شۆڕش بوون. بەڵام ئەحمەدی نەژاد، کە لە پارێزکاران بوو، لەهەموویان زیکتربوو لە عەلی خامەنەیی ڕابەری شۆرش، و پابەندترینان بوو بە بنەمای فەرمانڕەوایەتی شەرعزان.

بەڵام گەروە ڕکابەری ئەحمەدی نەژاد بریتی بوو لە میر حوسەین موسەوی، کە لە چاکسازان بوو، لەهەمان کاتدا لە ڕۆلەکانی شۆرش بوو، و هەروەها لەگەڵ خومەینی لەپاریس ەوە بۆ تەهران کۆچیکردووە، و لەسەردەمی خومەینی لە ساڵی ١٩٨١ تا ساڵی ١٩٨٩ی زاینی سەرۆك وەزیران بووە، و دواهەمین سەرۆك وەزیران بووە بەر لە لادان و نەهێشتنی ئەم پۆستە! هەرچی کاندیدی سێیەمیش بوو، بریتی بوو لە مەهدی کەڕوبی کەلە چاکسازان بوو، هەروەها لەماوەی ساڵانی ١٩٨٩ تاوەکو ١٩٩٢ ی زاینی سەرۆکی چەرلەمان بووە. کاندیدی چارەمیش بریتی بوو لە موحسین ڕەزائی کە لە پارێکاران بوو، کە ئەویش سەرۆکی چاودێرانی شۆڕش بوو لەکاتی جەنگی ئێران و عێراق!!



ئەحمەدی نەژاد دەستی عەلی خامەنەیی ڕابەری شۆڕش

ئەمانە هەرهەموویان لە ڕۆڵەکانی ئەم ڕژێمە و پشتیوانی سەرسەختی هەموو ووتەیەکن کە لە زاری ڕابەری گشتی شۆڕشەوە بێتە دەرەوە.

لەوانە هەندێك جار ئەمە ڕوودەدات کە سەرۆك کۆماری هەڵبژێردراوی گەل، لەیادی بچێت، بڕیارێکی پێچەوانەی ڕای ڕابەری شۆرش بدات، ئەوکات چی ڕوودەدات؟!

پێویست بە پێشبینیکردن ناکات، ڕووداوێکمان بینی کە ئەم وێنەیەمان بۆ ڕووندەکاتەوە، بۆ نمونە، بەنی صەدر وەك یەکەم سەرۆك کۆماری ئێران لەسەردەمی خومەینی لەساڵی ١٩٨٠ی زاینی دا هەڵبژێردرا، بەنی صەدریش وایزانینی وەکو گشت سەرۆك کۆمارانی تری جیهان جڵەوی کاروبارەکانی وولاتەکەی بەدەستەوەیە، و بەتایبەتی لەبەرئەوەی

بەرێژەی ٧٥٪ هاتبووە سەردەسەڵاتیش، ئەم رێژەیەش هەروەك دیارە ژێژەیەکی زۆر بەرزە، بەڵام بینی کە هیچ هێزو توانایەکی نییە، ناتوانێ سەرۆك وەزیرانێك بۆ حکومەتەکەی ڕابسپێرێت، و ناشتوانێت کە بەشدار بێت لە هەڵبژاردنی وەزیرەکان، و بینی کە ناچارە بۆ وورد و درشتی کاروبارەکانی دەبێت بۆ ڕابەر شۆرش بگەڕێتەوە، بۆیە خۆی بۆنەگیراو ڕەخنەی لەم بارودۆخە گرت!

**باشە، ئەدی دەرئەنجامەکەی چی بوو؟!**



حەسەن بەنی صەدر

خومەینی حەسەن بەنی صەدر لەدەسەڵات دوورخستەوەو سەرۆك کۆمارێکی تری جێگەی ئەودا دانا!! خومەینی ئەوی لە دەسەڵات دوورخستەوە دوای ئەوەی کە ٧٥٪ی دەنگەکانی گەلی ئێرانی بەدەست هێنابوو، باشە ئەم هەڵبژاردنە چ بەهاو نرخێکی هەیە؟! باشە مێژگرد و تاوتوێکردنی هەڵبژاردنەکانی ئێران لە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن لە پای چی؟!

کاتێك عەلی خامەنەئی، کە لەساڵی ١٩٨١ تا ١٩٨٩ی زاینی سەرۆك کۆماری ئێران بوو، مۆڵەتی بە یاسای کار بەخشی، پاشان بەتوندی لەلایەن ئەنجومەنی پاراستنی دەرستورەوە بەتوندی بەرپەرچی درایەوە، خومەینی پەیامێکی هەڕەشە ئامێزی توندی ئاراستەی عەلی خامەنەئی کرد، لەم پەیامەییدا ئەمەی بەیادی هێنایەوە کە فەرمانڕەوایەتی شەرعزان وەکو فەرمانڕەوایەتی پێغەمبەرە

(صلی الله علیه وسلم)؛ چونکە ئەو لەلایەن پێشەوا غائیبەکەوە (الإمام الغائب) دیاریکراوە و، بۆیە سەرۆك کۆمار عەلی خامەنەئی ملکەچی فرمانەکەیی بوو، هەرچەندە دوای مردنی خومەینی ئەو بوو بە ڕابەری شۆڕش، بەهۆی ئەمەوە مەعصومیەت لە خومەینیەوە بۆ ئەو گوێزرایەوە، ئەوکات هیچ ڕەخنە و بەدواداچونێك بۆ فەرمانی ئەو قەبول ناکرێت!

## چاکسازەکان، ڕووەکەی تری پارێکارەکان

دوای ئەمە، چاکسازەکانیشمان بینی لە پۆستی سەرۆك کۆماریدا، موحەممەد خاتەمی لە ساڵی ١٩٩٧ تا ٢٠٠٧ی زاینی دا فەرمانڕەوایەتی ئێرانی کرد، ئایا شتێکی تازەمان بینی؟! ئایە هیچ شتێك لە ئێراندا بەدیدەکرێت لەکاتی فەرمانڕەوایەتی چاکسازەکان دا کە جیاواز بێت لەگەڵ کاتی فەرمانڕەوایەتی پارێزکارەکان؟ یاخود، جڵەوی کاروبارەکان لەکۆتاییدا بەدەستی تاکە کەسێکە کە ئەویش ڕابەری شۆڕشە؟!

پاشان، ئێمە دەڵێین کە چاکساز و پارێزکارەکان گوزارشت لە حیزبی جیاواز لە ئێراندا ناکەن، و هیچ دەزگاو ڕێکخراوێك نییە کە ڕێنماییەکانی سەرۆکێکی دیاریکراو لەخۆیەوە بگرێت؛ بۆ نموونە، لە هەڵبژاردنەکاندا، ئەحمەدی نەژادنوێنەرایەتی خۆی نەبێت هی کەسێکی تر ناکات، بەهەمان شێوە میر حوسەین موسەوی چاکسازیش، باردودۆخەکەی ئێران وەکو ئەوەی ئەمریکا نییە، کاتێك ئۆباما، بۆ نموونە، نوێنەرایەتی و گوزارشت لە دیموکراتەکان دا دەکات، لە کاتێکدا مەکین گوزارشت لە

پرۆگرامەکانی کۆمارییەکان دەکات. بارودۆخەکە زۆر لەمە سادەترە لەئێراندا، چونکە تەنها شانۆی (تمثیلیة) یەو هیچ سەنگێکی نییە.

تەنانەت کاتێك ململانێ لە شقامی ئێرانیدا لە نێوان پاڵێوراوان ڕوویدا، و پاڵێوراوان لە ناوەندەکانی ڕاگەیاندندا یەکتریان تۆمەتبار دەکرد، سەرکردایەتی ئایینی لەمە بێدەنگ بوو، ئەم بێدەنگ بوونەش بە دەستی ئەنقەست بوو، میری حوسەین ی دۆڕاو لە هەڵبژاردنەکە خوێندنەوەیەك بۆ ئەم بێدەنگییە دەکات و دەڵێت: "هەموو ڕێگاکانی بەدەست هێنانی مافەکان داخراون، گەلی ئێرانیش ڕووبەڕووی بێدەنگی پیاوە ئایینیە گرنگەکان دەبێتەوە". لە درێژەی ووتەکانیشدا دەڵێت کە ئەم بێدەنگیە لە ساختەکاری ترسناکترە.

پیاوانی ئایینی خۆیان بێدەنگ کرد تاوەکو ململانێیەکە بەدیار بکەوێت، چۆن بلێیت کە ململانێیەکە لەسەر پۆستێکی زۆر گرنگە، و تاوەکو دیموکراسی لە وولاتدا بەدیاربکەوێت، و بوونی دوو لایەن و بەچاکزانینی لایەنێك لەسەر لایەنەکەی تر و هەلبژاردنی لەرێگەی گەلەوە، لەکاتێکدا کاروبارەکە لە کۆتاییدا جگە لە شانۆیەك نەبێت هیچی تر نییە، کە گەل تێیدا ئەو ئەکتەرە هەڵدەبژێرن کە ئەو کارە جێبەجێ دەکات کە دانەری ئەم سیناریۆیە، رابەری شۆڕش، نووسیوویەتی! نەگبەتیەکە لێرەدایە، کە ڕابەری شۆڕش حوکم بە قورئان و سوننەت ناکات، بەڵکو هەوڵدەدات بۆ پتەوکردنی ڕەگی بیروباوەڕی ترسناك، بە ڕاسپاردەیی پێشەوایەتی غائیب و نادیار کە چۆتە ناو زێرزەمینەوە فەرمانڕەوایەتی دەکات، و تەواوی حکومەتەکەی بە هەوەسی خۆیی دەجولێنێت و بەهیچ شێوەیەکیش ناشێت ڕەختەنی لێبگیرێت.

## هۆکارەکانی سەرسام بوون

باشە گەر وایە، بۆچی بەم بارودۆخە سامناکە سەرسام دەبین؟! بۆچی هەندێ نووسەر دەبینین - هەندێ جار ئیسلامییەکانیش - ئێران وەکو نموونەیەك لەقەڵەم دەدەن، و دەڵێن پێویستە چاوی لێبکرێت؟!

سەرسامییەکەمان بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە؛ لەوانە، ئێمە هەموومان ئەم ڕاستیانە نازانین کە دەستوری ئێرانی و سیستەمی فەرمانڕەوایەتیەکەی و پەیوەندی نێوان ڕابەری گشتی و سەرۆك کۆمار ەکەی دا هەیە، هەروەها ئێمە بە سۆزو عاتیفەمان نەك بە بیرو هۆشمان بڕیار دەدەن، مەیلمان بۆ ئەو کەسە دەجولێت کە ئاڵای ئیسلام بەرز بکاتەوە، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسە لارو لەورێری و ئایین گۆڕیش بکات، هۆکارێکی تر ئەوەیە کە ئێمە ئیسلامە ڕاستەقینەکەمان نەناسیوە کە ڕێگە بە موسلمانان دەدات گازاندە و ڕەخنە لە ئیمامی ئەبو بەکر و ئیمامی عومەر (رضي الله عنهم) بگرن، هەروەها ڕێگەشیان پێدەدا کە گفتوگۆ لەگەڵ پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم) دا بکەن لە کارێکدا کە وەحی و سروش نەبێت.

هۆکارێکی تر بریتییە لەوەی کە ئێمە لە وڵاتانی عەرەبیدا بە دەست فەرمانڕەوایی دیکتاتۆری توندڕەو و ساختەکاریەکی حەیابەر و گەندەڵییەکی گشتگیرەو دەناڵێنین. هەروەها ئێمە بەدوای نموونەیەکی سەرکەوتوودا دەگەڕێن ئەگەر بێتوو بە ڕێژەیەکی کەمیش بێت، و چاو پۆشیش لەگەڵێك شتی نەرێنیش دەکەین، چاومانی لە ئاستیاندا

دەنوقێنین، تاوەکو لە کۆتاییدا بڵێین: سوپاس بۆ خودای گەورە، دەوڵەتێکی ئیسلامی هەیە کە ڕاوێژ جێبەجێ دەکات!! هۆکارێکی تر ئەوەیە کە ئێمە بەدواداچوون ناکەین بۆ ئەو مەترسیانەی کەووبەرووی عێراق و بەحرەین و سعودیە و میسرو لوبنان، تەنانەت سوننەکان ناوخودی ئێرانیش، دەبێتەوە لە ئەنجامی حوکمڕانی ئەم ڕابەرەی کە باوەڕی بەبنەمای فەرمانڕەوایەتی شەرعزانەوە هەیە، کەی پێیوایە کە سوونەکانی جیهان هەموون لەئایین تێیانپەڕاندووە، هەروەها ئیمامی غائیبیش ئەوی ڕاسپاردووە بۆ ئەوەی کاروباری دونیا چاك بكات بۆ ئەوەی کاتێك ئیمامی مەهدی دەگەیڕتەوە جڵەوی کاروبارەکانی لێوەربگرێتەوە.

هۆکارێکی تری سەرسامبوونمان بە ئێران بریتییە لەوەی کە ئێمە لەدەست ستەمی ئەمریکاو جولەکە دەناڵێنین، دڵخۆش دەبین ئەگەر کەسێك لەدژی ئەوان قسەیەك بكات،و گرنگیش بە بەدواداچوونی ڕووداوەکان و خوێندنەوەی مێژووش نادەیین، تاوەکو بزانینین کە ئەگەری هێرشکردنی ئێران بۆ سەر ئیسرائیل بۆ مەبەستی رزگارکردنی فەلەستین یەکسانە بە صفر!

پێویستە لەسەرمان-ئەی مسوڵمانان-کە ئومەتەکەمان لەسەر بنەمایەکی ڕاست و دروست دابمەزرێنین، ئەمەش نە لە پرۆگرامی ڕۆژهەڵات و نە هی ڕۆژئاواشدا نییە، هەروەها لە بنەماکانی مەزهەبی شیعە و خەوریجیشدا نییە، بەڵکو ئەم بنەما ڕاست و دروستانە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دا هەیە. هەروەها لە گەڕانەوە بۆ بنەماکانی ئایین و دیراسەکردنی

ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سەبارەت بە گۆڕان دایە، هەروەها بە گەڕانەوە بۆ ڕێبازی پیاوچاکان لە مێژووی ئومەتەکمان، ئا چەندە زۆرن! بەڵام سەرسام بوون بە لارو لەوێرو لەڕێ لادەرەکان لە کەسایەتی و خاسیەتی پیاو چاکان نییە.

# دەعبایەکی ژێردەستە

بەدەگمەن دەبینیت کە رۆژنامەیەکی عەرەبی یان جیهانی، یان بڵاوکراوە هەواڵییە عەرەبی و جیهانییەکان باسی هەواڵێکی تایبەت بە هەڕەشەکردنی ئەمریکا بۆ سەر ئەمریکا نەکات، یاخود باسی ئەگەری پەلاماری سەربازی ئەمریکا بۆ سەر ئێران نەکات، ئەمەش لەبەر چالاککردن و پیداندانە ناوەکییە دیارەکەی کە ئەم دەوڵەتە "پێشێلکار" ە یە، بە گوێرەی وەسفکردنی جۆرج بۆشی سەرۆك کۆماری ئەمریکی بێت.

زۆر کەس دەپرسن:

ئاخۆ دەبێت ئەمریکا - بەکردار - بیەوێت بەرەیەکی جەنگ لە دژی ئێراندا بەرووی خۆیدا بکاتەوە؟ ئایا مەترسی پیتاندنی چەکی ناوەکی دەبێتە پاڵنەرێك بۆ ئەمریکا تاوەکو هەمان ئەزموونی عێراق لە ئێراندا دووبارە بکاتەوە؟ ئایا بەرژەوندنی ئەمریکا لە جیهاندا ئەمە دەخوازێت کە ئەمریکا ئەم هەنگاوە ترسناکە بهاوێژێت؟

هەموو ئەمانە پرسیارگەلێکن وائەکات جیهان بەشێوەیەکی گشتی بەگرنگی یەوە چاودێری ئەم پرسە هەستیارە بکەن..

بەتێڕوانینی من سەبارەت بەم پرسە ئەوەیە کە ئەگەری لێدانی ئێران لەلایەن ئەمریکاوە زۆر دوورە، بەڵکو نەوانەیە بۆ جارێکیش بێت ڕوو نەدات، چونکە:

**یەکەم:**

ئەمریکا ئەوەندە گەوج نییە تاوەکو بەرەیەکی تازەی جەنگ بەڕوو خۆیدا بکاتەوە لە ئێراندا؛ ئاشکرایە کە سەربازانی ئەمریکی چونە ناو زۆنگاوی عێراقەوە، تووشی بەڵایەك هاتن کە پێشبینیان نەدەکرد، تووشی زەرەر و زیانێکی زۆر بوون، زۆربەی خەڵکی ئەمریکی داوای کشاندنەوەی هێزەکانیان دەکەن لە عێراقدا، هەروەکو هەردوو پاڵێوراوی ئەمریکی، ئۆباما و مەکین، ئێستا پێشبڕکێ دەکەن لەسەر دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەك بۆ کۆتایی هێنان بە قەرانی عێراق.

**دووەم:**

لەڕاستیدا ئەمریکا باش دەزانێ کە لێدانی ئێران دەبێتە هۆی یەکخستنی شیعە و سوننە - بەلایەنی کەم لەڕووی سیاسییەوە - لە پرسێکی دیاریکراودا کە ئەویش جەنگانە دژی ئەمریکاییەکان، بەدڵنیاییەوە ئەوکات زنجیرە فلیمی سەربڕینی سوننەکان لەلایەن شیعەکانەوە لە عێراق ڕادەوەستێت، ئەمەش ئەمریکیەکان زۆر ماندوو دەکات، چونکە بەرگرێکی ڕاستەقینە ئەگەر هەبێ لە دژی ئەمریکا لەعێراقدا ئەوا بەرگری سوننەکانە، و ئەوکاتیش ئێران وازدەهێنێ لە هاریکاریکردنی شیعەکانی عێراق، لە ئەنجامدا تای تەرازوویی سوننەکان بەرز دەبێتەوە لە عێرقدا، بێگومان ئەمەش کاریگەریەکی نەرێ و سلبی لەسەر بوونی ئەمریکا لە عێرقدا دەبێت.

### سـێیەم:

تاکە ئەزموونی ئەمریکا لە ئێران لە ساڵی ١٩٨٠ی زاینیدا، بۆ ڕزگارکردنی چەند دیبلۆماتکارێکی ئەمریکی دەستبەسەرکراو



لەلایەن لاوانی شۆڕشی ئێرانییەوە، ئەزموونێکی نەرێنی بوو، کە ئەمریکا تێیدا چەند سەرباز و چەند فڕۆکەیەك و هەڵوێستێکی سیاسیشی لەدەستدا، هەروەها سروشتی شاخاوی و بیابانی ئێرانیش ڕێگرە لەبەردەم ئەمریکا کە بڕیاری هێرشی سەربازی بۆسەر ئەم وڵاتە بدات.

**چـــوارەم:**

هەروا هەوەنتە نییە کە دەوڵەتێك بڕیاری هێرشکردنە سەر دەوڵەتێك کە خاوەنی نەوەوی بێت، ئەمریکاش باش دەزانێ کە پیتاندنی یۆرانیومی ئێرانی شتێکی وەهمی نییە وەکو ئەوەی کە عێراقی پێیتاوانبار دەکرد؛ و پاشانیش لە لێدانی ئێراندا دەبێت مەترسی گەیشتنی سەری نەوەویەکەیە بۆ شوێنێکی هەستیار بۆ ئەمریکا، لەبیریشمان نەچێت کە قەتەر گەورەترین بنکەی سەربازی ئەمریکی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەخۆدەگرێت، هەروەها دەبێت ئەوەش بزانین کە جولەکەکانی فەڵەستین لە ئێرانەوە دوورنین، ئەمەو جگە لە بوونێکی چڕی ئەمریکییەکان لە عێڕاق و کوێت دا.

**پێنجـــەم:**

بێگومان لە مێژووی هاوجەرخ و کۆندا هیچ دەوڵەتێکی شیعەکان نەبووە کە بووبێتە مەترسی بۆ سەر هیچ دەوڵەتێکی ناموسڵمانی شەرخواز (المحاربة) لەبەرامبەر موسڵماناندا، ئەم دەوڵەتە شیعانە لەوە ڕانەهاتوون کە کەڵبەکانیان بەڕووی ئەم داگیرکەرانەدا بەدیاربخەن، تەنها ئەو کاتە نەبێت کە ڕووبەڕووی خودی خۆیان ببێتەوە و ئەوەش

تەنها لەبەر مانەوەی خۆیان بووە، و هەموو جارێکش ئەم دەوڵەتە شیعانە هێزو تواناکانیان بەکارهێناوە لە جەنگان لە دژی دەوڵەتە سوننییەکانی دراوسێیان. بۆ نموونە:

دەوڵەتی بوهی شیعە لە دژی دەوڵەتی بێزەنتی نەسرانییەکان نەدەجەنگا کە لەنزیکیشیان بوو، لەکاتێکدا دژایەتی خەلافەتی عەبباسی دەکرد کە سوننە بوو.

هەروەها لە دەوڵەتی شیعەی عوبەیدیەکان (کە بەدرۆ ناویان لەخۆنابوو فاتیمیەکان) دژایەتی خاچپەرستانیان نەدەکرد لە باکور ئەندەلوس، بەڵکو هاوکاریشیان کردن لە دژی جەنگانیان بەرامبەر بە دەوڵەتە سوننیەکەی عەبدولرەحمان ناصر لە باشووری ئەندەلوس دا. بەهەمان شێوە، شیعەی عوبەیدیەکان لە میسردا دژایەتی خاچپەرستەکانیان نەدەکرد لەکاتی داگیرکردنی وولاتی شام و فەڵەستین، بەڵکو هاوکاریشیان پێشکەشکردن بۆ لێدانی سەلجوقیە سوننیەکان لەم ناوچانەدا، هەروەها پێشنیاری دابەشکردنی هەرێمی سوننە نیشینەکانیشیان لەنێوان خۆیاندا بۆ کردن. هەروەها دەوڵەتی سەفەوی شیعی دژایەتی فەرەنسا و بەریتانیا و روسیای نەدەکرد، بەڵکو دژایەتی دەوڵەتی عوسمانی سوننی دەکرد. دەوڵەتی ئێرانی شیعە مەزهەب دژایەتی رووسیای مولحیدی نەدەکرد، بەڵکو دەچوو تێکۆشەرانی ئەفغانی دەرفاند، هەروەها دژایەتی ئەمریکاو ئیسرائیلی نەدەکرد بەڵکو هەشت ساڵ لەدژی عێراقدا شەڕیکرد. تەواوی ئەم مێژووانە ئەوە دەسەلمێنن کە ئێران شەڕ لە دژی ئیسرائیل یان ئەمریکادا ناکات، مەگەر ئەوکاتە نەبێ کە وولاتەکەی لەلایەن

ئەمانەوە داگیربکرێت، لێرەدا چەپۆکی خۆی لەبەرگریکردنی ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی پیشان دەدات، هاوشێوەی ئەوەی کە بەسەر حیزبوڵڵای شیعی داهات لەکاتی داگیرکردنی باشووری لوبناندا.

شــەشــەم:

لەئەم چەند مانگانەی ڕابردوودا بینیمان کە ئەحمەدی نەژاد سەردانی عێراقی کرد، ئەم سەردانی کردنەشی لەژێر سایەی پاسەوانی ئەمریکادا بوو!! ئەمەش جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پەیوەندیەکانیان بەم شێوەیە خراپ نییە کە میدیاکان باسی لێوەدەکەن. باشە ئەگەر وایە، بۆچی مەسەلەی پیتاندنی یۆرانیومی ئێرانی وا گەورە دەکرێت، کە بەردەوام هاشوهوشی لێدانی لەسەردەکەن؟! بە بۆچوونی من، ئەمە تەنها یەك واتایی هەیە، ئەویش بریتیە لەوەی کە ئەمەریکا دەیەوێت دەعبا (بعبع) یەکی تازە دروستبکات و ناوچەکەی بەتەواوی پێبترسێنێت، بەشێوەیەك بوونی ئەمریکاش لە عێراق و کەنداوی عەرەبیدا دەکاتە مەهانە، بەوەی کە ئێران هەڵدەستێت بە گێڕانی هەمان ئەو ڕۆڵەی کە سەدام حوسەین لەپێشتردا دەیگێڕا، کاتێك کە ئەمریکا سورڕبوو لەسەر هێشتنەوە سەدام بۆ ماوەی سێزدە ساڵی تەواو بێ زەرەرو زیان، ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە هەموو وولاتانی ناوچەکە ڕازی ببن بە بوونی پارێزەرە بەخشندەکە (واتە: ئەمریکا)؛ بۆ ئەوەی وولاتە ئیسلامیەکان لە زیانەکانی سەدام بپارێزیت! پاشان ڕۆلی سەدام تەواو بوو، و بێتواناییەکەی گەیشتە ئەو ڕاددەیەی کە بەمەترسی دار نەژمارنەکرێت بۆ دەوروبەری

خۆی، ئەو کات "شانۆگەری" چەکی کۆمەڵکوژ پاشان لە ناوبردنی سەدام و داگیرکردنی عێراقیش هاتە ئاراوە. هیچ یەکێکش چەککی کۆمەلکوژیشی و ناکۆمەڵکوژیشی لە عێراقدا نەبینییەوە، بەڵام داخەکەم خەڵکی شتەکان زوو لەبیردەکەن، ئێستاش ئەمریکی پێویستی بە دەعبایەکی تازە هەیە کە لە کۆنترۆلکردنی ناوچەکەدا بیهێڵێتەوە، و بۆ ئەوەی هیچ کەسێك ئازار نەداو جنجرۆکیشی لێنەروێت، هێرشیش نەکات و پشێویش نەنێتەوە، بۆ ئەم ڕۆڵەش ئەمریکا جگە لەئێران کەسێکی باشتری چەنگ ناکەوێت، بۆ ئەم مەبەستەش سەرکردایەتی ئەم شالاوە میدیایە سیستەماتیکیەی دەکات. بێگومان پاش چەند ساڵێکی تریش ڕۆلی ئێرانیش تەواو دەبێت، و ئەوکات ئەمریکا بەدوای دەعبایەکی تازەی دیکەدا دەگەرێت، ئەم یاریە بێمانەیەش کۆتایی نایەت تەنها ئەوکاتە نەبێت کە مسوڵمانان بتوانن خۆیان بەرگری لەخۆیان بکەن لەدژی هەر دەعبایەککی ناوچەکە، جا ئەم دەعبایە ئێرانی یان ئەمریکی یان ئیسرائیلی بێت تەنانەت ئەگەر بێتوو لە دەرەوەی بۆشایی ئاسمانیشەوە بێت!!

# هەڵوێستمان بەرامبەر بە شیعەکان

هەندێ لە ڕاگەیاندنکارەکان مسوڵمانانان ئاوا تێدەگەێنن کە ئەو شتەی پشتیانی شکاندووە بریتیە لە کردنەوەی باس و خواسی شیعەکان، ئەمەش لەسەر ئەو بنەمایەی کە مسوڵمانان لە شیعەو سوننە پێکدێن، هەروەها کردنەوەی ئەم باسە ئوممەتی ئیسلامی بەسەر دوو بەشدا دابەشدەکات.

**ئەم قسەیەش لەدوو لایەنەوە هەڵەیە..**

لایەنی یەکەم:

بریتیە لەوەی کە شیعەکان لە لەناو قەوارەی ئوممەتی ئیسلامیدا تەنها ١١٪ ئەم قەوارەیە پێکدەهێنن (کەدەکاتە ١٥٠ ملیۆن کەس لەسەر ئاستی جیهاندا)، ستەمێکی ڕوون و ئاشکرایە کە تەواوی ئوممەت لەبەها نەگۆڕەکانیدا دەستبەرداربێت وپاشەکشێبکات؛ تەنها لەبەر هێشتنەوەی ئەم بڕەکەمە لەناو قەوارەی مسوڵماناندا بەبێ ئەوەی کە داوابکرێت لەم شیعانە کە پابەندی بنەماکانی ئوممەتی ئیسلامی ببن لەڕووی بیروباوەڕ و خووڕەوشت و مێژووی و سیاسی دا.

هەرچ لایەنی دووەمیشە:

بریتیە لەوەی کە یەکێك لەبەشەکانی پێشوودا بەناونیشانی "ترسناکی شیعەکان" باسمانکرد، کە فیتنە و ئاشوبەکە نەخەوتووە تا ئێمە هەوڵی بەخەبەر هێنانی بدەیین، بەڵکو ئاگری ئاشوبەکە خۆیی لەخۆیدا لەسەر ئەرزی واقیعدا گڕ گرتووە، بەتوندترین شێوە، و کاریگەریەکەشی لەسەر زیاتر لەناوچەیەك لە جیهانی ئیسلامیدا ڕەنگی داوەتەوە، لە سەرەتادا لە عێراق، باشە ئێمە دەبێت چیبکەیین لەکاتێکدا بەچاوی خۆمان دەبیین کە بەردەوام خوێنی مسوڵمانە سوننەکان دەرشێندرێت لەم وولاتەدا، و هەروەها بەهەدەردانی سامانی ئەم دەوڵەتە گەورەیە، هەروەها ئەو خۆئامادەکردن و خۆپڕچەککردنە دیارو ئاشکرایەی ئێران بۆ هەڕەشکردن لە وولاتانی تر لە دوورو نزیکیدا.

لەڕاستیدا، ئێمە کاتێك قسە لەسەر ئەم بابەتە دەکەین گەرەکمانە کە ڕەگ و ڕیشەی کێشەکە تێبگەیین، و پاشانیش هەندێك چارەسەری لوجیکیشی بۆ دابنێین، بەڵام بەبێ ناسین و زانینی سەرهەڵدان و ڕەگ و ڕەچەڵەك و پەیڕەو پڕۆگرام و هیوا و ئاواتی شیعەکان، چۆن دەتوانین چارەسەر بۆ ئەم کێشەیە بدۆزیینەوە؟!

بێگومان لەبەشی "ترسناکی شیعەکان" دا لایەنێك لە لایەنەکانی ترسناکی شیعەکانی هاوچەرخ لەسەر ئێستای ئوممەتەکەمان دا خستەڕوو، لەوێدا بە شێوەیەکی دیاریکراو باسی پێنج مەترسیمان کرد، کەهەریەکەیان دەکرێت ببێتە هۆکارێك بۆ کردنەوەی ئەم باس و خواسە، تەنانەت بەشێوەکی توندیش. پێنج مەترسیەکانیش بریتین لە:

## یــەکـەم:

هێرشکردنی بەردەوامی شیعەکان بۆ سەر ئەصحابەکان، تەنانەت کارگەیشتۆتە ئەوەی کە ئەم هێرشکردنە بۆتە شتێك وەك چۆن بڵێیت کە بریتی بێت لە بنەمایەك لە ئایین لە لای ئەوان دا، هەروەها بۆتە ڕق وقینەیەکی ڕوون ئاشکرایان هەیە بەرامبەر بە ئەصحابان، بەشێوەیەك سنوری بەزاندووە، تەنانەت، ئێمە لەپێگەی ئەلیکترۆنی خۆمان (www.islamstory.com) دا بەردەوام کۆمێنتگەلێکمان لەلایەن شیعەکانەوە بۆ دێت کە بەلێشاو بێزاندن و نکۆڵیکردنی خۆیان دەردەبڕن سەبارەت بەو ووتارانەی کە تایبەتن بە باس و خواسی ئیمامی "ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان" هەروەها سەبارەت بەو ووتارانەی کە باس لە کۆیی ئەصحابان (رضي الله عنهم) دەکات؛ تەنیا بینینی ناو صەحابەیك هەستیاریەکی گەورە و کاردانەوەیەکی زۆر توندی شیعەکان لێدەکەوێتەوە، ئێ باشە چۆن بێدەنگبین دەرهەق بەم جۆرە تاوانە؟! هەروەك باسمان کرد، بێدەنگ بوون و خۆکڕکردن لەبەرامبەر بەم جۆرە کارە قێزەوەنەی شیعەکان بریتیە لە بەفیڕۆدانی ئایینەکەمان و ناشکرێت ئێمەش ئەنجامی بدەیین.

## دووەم:

ترسناکی بەشیعەکردن لە سەرانسەری جیهانی ئیسلامیدا، جا چ بەشیعەکردنێکی ڕاستەوخۆ یاخود بە گۆڕینی بیروباوەڕ و بڵاوکردنەوەی هزری شیعی بەدەرك نەکردن بەوەی کە ئەم کردارە بریتیە لە بوون بەشیعە.

سێیەم:

کوشتنی هەزاران کەس لەئەهلی سوننە لە عێڕاقدا.

چوارەم:

هەڕەشەکردنێکی ڕاستەوخۆ بۆ کۆنترۆلکردنی سەربازی و سیاسی و ئابووری لە وولاتی عێراقدا، هەروەها خزمەتکردنی بەرژەوەندیە باڵاکانی ئەمریکا بەم ئاراستەیە.

پێنجەم:

هەڕەشەکردنێکی ڕاستەوخۆ لە دەوڵەتەکانی تری ناوچەکە جگە لە عێڕاق، باسی چەند نموونەیەکیشمان کرد لەوانە هەڕەشەکردنی شیعەکان لە ئیمارات و بەحرەین و سعودیە، نازانیین بەرژەوەندی بریتییە لە بێدەنگی تاوەکو ئەو وولاتانە لەدەست بچن؟ یاخود پێویستە کارێکی ئەرێنی ئەنجام بدرێت بۆ پاراستنی هێمنی و ئاسایشی ئەم وولاتانە؟

ئەمانە ئەم پێنج خاڵە بوون کە لەبەشێکی پێشووتردا بەناونیشانی "ترسناکی شیعەکان" دا بەدوورودرێژی باسمان لێوەکردووە، بۆیە داوا لە خوێنەرانی بەرێز دەکەین، لەبەر ترسناکی پرسەکە، ئەم بەشە بە دیقەکەتەوە بخوێننە، هەروەها داواشیان لێدەکەین کە بەشەکانی "ڕەچەڵەکی شیعەکان" و دەستڕۆیی شیعەکان" بخوێننەوە، بۆ ئەوەی بەتەواوی لەبابەتەکە تێبگەن.

بەڵام ئایا تەواو، ئەم پێنج خاڵە هەموو شتێکە؟!

وەڵامەکەی بەداخەوە: نەخێر!

مەترسی شیعەکان زۆر لەمە گەورەتر، ئەگر چاوێك بەمێژوودا بخشێنین دەبینین کە خراپبوونی بارودۆخەکان زۆر لە ئەندیشەو وێناکردنی ئێمە دوورترە، شیعە عوبەیدیە ئیسماعلیەکان میسریان داگیرکرد، بۆ ماوەی زیاتر لە دوو سەد ساڵی یەك لەدوای یەك، ئەم شتێك بوو کە زۆربەی ڕەشبینەکانیش پێشبینیان نەدەکرد، بەڵام ڕوویدا، لێرەوە لێدانی زەنگی ئاگادارکردنەوە شتێکی زۆر گرنگ و پێویستە سەبارە بەم مەترسییە.

بۆیە ئێستا با بەردەوام بین لەسەر باسکردنی ترسناکی شیعەکان لەسەردەمی هاوچەرخی خۆماندا.

**شەشەم:**

نزیك بوونەوەی ئێران و سوریا و مەترسیەکانی..

نزیك بوونەوەیەکی بەهێز لە نێوان ئێران سوریا بەشێوەیەکی ڕوون ئاشکرا بەدیار دەکەوێت، مەترسی ئەم کارەش کاردانەوەی لەسەر بارودۆخە مەترسیدارەکەی سوریاوە دەبێت، کە بۆ ماوەی نزیکەی چل ساڵ دەبێت کە فەرمانڕەوایەتی دەکرێت لە لایەن نوسەیرییەکانەوە (کە بەعەلەوییەکان ناسراون)، ئەمانەش ڕەچەڵکیان دەگەڕێنەوە بۆ دامەزرێنەری مەزهەبەکەیان کە بریتی بوو لە ئەبو شوعەیب

موحەممەدی کوڕی نوسەیرِی بەسرِی (کە لە ساڵی ٢٧٠ی کۆچیدا مردووە)، نوسەیرِی بانگهێشتەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، هەروەها بانگهێشتەی ئەوەشی دەکرد ئیمامی عەلی خودایە-پەنا بەخودای تاك و تەنیا لەوەی کە ئەوان دەیلێن.

سەرەڕای ئەمە، کە بنەماڵەی نوسەیرِییەکان لەسوریادا زیاتر لە ١٠٪ ی دانیشتوانی سوریا پێکناهێنن، بەڵام بەتەواوی دەستیان گرتووە بەسەر جڵەوی دەسەڵاتدا، بەتەواویش رێگەیەکی فراوان خۆش دەکەن بۆ بە شیعەبوونی دەوڵەتەکە، پاشانیش پەیوەندیداربوون بەو شتەی کە پێیدەوترێت هیلالی شیعی کە پێکدێت لە ئێرانەوە بۆ عێراق لەوێشەوە بۆ سوریا لەوێشەوە لە لوبنان، کە بەربەستێکی پڕ مەترسی دروستدەکات لەبەرامبەر ئوممەی ئیسلامیدا، رۆژهەڵاتی لە رۆژئاواکەی جیادەکاتەوە، زەنگی مەترسی فراوانبوونێکی ئەو تۆیی شیعەکان لێدەدا کە دووریەکەی بەخەیاڵمان دانایێت.

**حەفتەم:**

بارودۆخێکی زۆر ترسناك لە ئارادایە، کە دەخوازێك هەڵوەستەیەکی یەك لاکەرەوەی لەگەڵ دا بگیردرێتە بەر، و ناشبێت ئەم پرسە دوابخەین بۆ کاتێکی تر، ئەویش هەڵخەڵتانی موسڵمانە سوننەکانە بە ڕەمزە گەورەکانی شیعەکان، بەتایبەتی حەسەن نەسروڵلای سەرۆکی حیزبوڵلای لوبنانی و ئەحمەدی نەژادی سەرۆك کۆماری ئیرانی یە.

هیچ قسەی لەسەر نییە کە هەندێك لە هەڵوێستی ئاشکرای ئەم دوو ڕەمزە دیارەی شیعەکان بۆتە مایەی هەڵخەڵەتانی زۆرێك

لە مسوڵمانە سوننەکان، بەتایبەت لە سایەی نەبوونی ڕەمزێکی هاوشێوەی ئەوانن لە سەرکردەکانی دەوڵەتە ئیسلامیەکان، کە بەسەر سوننەدا دێنە ئەژمارکردن! هۆکاری هەڵخەڵەتانەکەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرکەوتنەی کە هەریەکە لە ئەوان لەبردنەوەی قەزیەکانیان دا بەدەستیان هێناوە، جا چ لە قەزیەی شەڕکردنی حیزبوڵڵا لەدژی ئیسرائیل، یاخود پرسی دروستکردنی دەوڵەت بێت لەلایەن سەرۆکی ئێرانەوە.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم کە سەرنجی مسوڵمانە سوننەکان ڕابکێشم کە بەدەستهێنانی سەرکەوتن لەپرسێك لەپرسەکان واتایی ڕاست و دروستە بیروباوەڕ، و ساغ و سەلامەتی ڕێباز کەسە سەرکەوتووەکە ناگەیێنێن، پاشانیش ناکرێت لەهەموو کەم و کورتیەکانی ئەوکەسە چاوپۆشی بکەییت داخوا چییە لە یەکێك لەکارەکانیدا سەرکەوتنی بەدەستهێناوە، جا با سەرکەوتنێکی گەورەش بێت، لەبیرمان نەچێت کە دەوڵەتی عوبەیدیەکان چەڵەکان کە شیعەبوون، سەرکەوتنی سەربازی و سیاسی ئەوەندە گەورەیان بەدەست هێناوە کە بەدەیان و سەدان قات گەورەتر بوون لە سەرکەوتنەکانی ئێران و حیزبوڵڵا، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا، بەگەورەو پێشەنگی خۆمانیان نازانین، تەنانەت ئێمە سەرکردیەکی سوننی عەلمانیش - با سوننەش بێت - وەك پێشەنگ و چاوساغی خۆمان نازانین، چونکە ئێمە بڕوامان وایە کە سەرکردەی ئیسلامی ئەو سەرکردیەیە کە تەواوکاری و هاوسەنگی و گشتگیری لە بوارەکانی بیروباوەڕ و خووڕەوشت و زانست و کردار دەستەبەردەکات، هەروەها جیهاد و تێکۆشانەکەی تەنهاو تەنها لەپێناوی خودای گەورە

و سەرخستنی ئایینەکەی و چەسپاندی شەریعەتەکەی دەبێت بەبێ ئەنجامدانی دەستکاری وگۆڕانکاری تێیدا.

با ئێستاش پەیامێك ئاڕاستەی ئەوکەسانە بکەم کە خەون بەوەوە دەبینن کە سەرۆکێکی شیعی سەرکردایەتییان بکات، با ئەو سەرکردیە میانەڕەویش بێت، بەو کەسانە دەڵێم: ئایا ڕازیدەبن کە باوەڕ بەو دوازدە ئیمامەکە بکەن کە شیعەکان خەڵکی یان بۆ بانگدەکەن؟ باشە ئەوکاتە ڕازی دەبین بەوەی دەستبەرداری مێژووی ئەصحابان و مەزهەبە فیقهیەکانمان و ئەو کتێبە سوننیانەی کە متمانەمان پێیان هەیە ببین؟ ئایا پێشبینی ئەوە دەکەین کە لەکاتی فەرمانڕەوایەتی سەرکردەیەکی شیعەدا پرۆگرامی خوێندن بەگوێرەی پەیڕەوی ئێمەی سوننە دەبێت یان بەپێی مەزهەبی شیعەکان دەبێت؟!

لەڕاستیدا شا ئیسماعیل صەفەویی دەوڵەتێکی زۆر بەهێزی لە ئێراندا دامەزراند، لە ڕووی کارگێڕی و ڕێکخراوەییەوە بەرێکوپێکی بونیادی نا، بەڵام پاش ئەوەی کۆڵەگەکانی ئەم دەوڵەتەی تەواوکرد چی بەسەر ئەم دەوڵەتە هێنا؟ سەیرێکی بەشی "دەسەڵاتداری شیعەکان" بکەنەوە تابزانن کە شا ئیسماعیل صەفەویی چۆن دەسەڵاتەکەی بەکارهێناوە لە لێدانی دەوڵەتی عوسمان لەدواوە، و بڵاوکردنەوەی شیعەگەری لە عێراق دا، و هەروەها لە هاوپەیمانی لەگەڵ پرتوگاڵەکان لە دژی عوسمانییە سوننەکان.

بێگومان، ئاینی ئیسلام یەك پارچە..ناکرێت لایەنێکی وەربگرین و لایەکەی تریشتی فەرامۆش بکەیین، خودای گەورە دەفەرمۆێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةٗ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴾ سورەتی البقرە: ٢٠٨.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتانهێناوە، بەتەواوەتی بڕۆنە ناو ئاینی ئیسلامەوە؛ نەکەن هەندێکی لێوەر گرن و ئەوەکەی تریشی ڕەتبکەنەوە)، بۆیە ئەگەر بەدوای پێشەنگیش دادەگەڕێین با پێشەنگێکی کامڵ بێت، ئەگەر لە لایەنێکیش ناکامڵ بوو، با ئەو ناکامڵییەی لەڕووی بیروباوەڕ و هزرییەوە نەبێت، ئەگینا سەرئەنجامەکە مەترسیدار و پڕ زەرەرو زیان دەبێت.

**هەشتەم:**

بەداخ و چەژارەیەکی زۆرەوە گێڕانەوەکانی شیعەکان بەشێوەیەکی زۆر قێزەوەن دزەیکردۆتە ناو کتێبەکانی مێژوو، بۆیە کاتێك بمانەوێت مێژوو بخوێنینەوە، و سود و قازانجی لێبکەیین، پێویستە پاڵافتەی بکەین و پاکیبکەیینەوە لەهەموو سەختەکاری وگۆڕانکارییەك، ئەمەش ئەرك و واجبێکی گرنگ و بنەڕەتییە، ئەگینا سەروەت و سامانێکی زۆر زەبەندمان لەدەست دەچێت، تەنانەت سەرگوزشتە و ژیاننامەی چاکترین و باشترینی خەڵکی لە باشترین سەدەو سەردامدا کە صەحابەکانن شێوێندرایەوە.

سەرەتا پێویستە کە درك بەترسناکی شیعەکان لەسەر کتێبەکانی مێژوو بکەین و ئینجا پاککردنەوەی ئەم کتێبانە لە گێڕانەوە ساختەکانی شیعەکان، پاشانیش هەڵهێنجانی ئەو دەرس و وانانەی،

دوابەدوای ئەوەی کەلە ڕاستی ودروستی ئەم گێڕانەوانە دڵنیا بووین..بەمەبەستی هۆشداری دان سەبارەت بەمەترسی ئەم پرسە، خۆم هەڵسام بە سەرژمێرکردنی ئەو ڕیوایەتانەی کە گێڕدراوەتنەوە لەباس و خواسی شەڕی صەفین "موقعه صفين" لە کتێبی مێژوویی تەبەڕی (تأريخ الطبري)، بینیم کە کۆی گشتی ڕیوایەتەکان ١١٣ ن، کاتێك بەوردی بەدواداچوونم بۆیانکرد، بینیم کە ٩٩یان بریتین لە گێڕانەوەو ڕیوایەتی شیعەی داخ لەدڵ، کە تەها ئامانجی بریتیە لە ناشیرینکردنی ئەصحابانە، ئەم ڕیوایەتانەش بریتین لەوانەی کە شیعەکان خۆیان گێڕایتیانەوە، یاخود لەلایەن ئەو سوننە میدیاکارە نەزانانەی کە بەبیروڕای شیعەکان سەرسامن گێڕدراوەتنەوە، هەنجەتیشیان ئەوەیە کە ئەم ڕیوایەتانە لە مێژووی تەبەڕی دا هاتوون، کە تەبەڕی یەکێ بووە لە هەرە زانا بلیمەت و گەورەکانی ئەهلی سوننە، بەڵام کەسەکان سەیری ئەو سەنەدانە ناکەن کە تەبەڕی باسی لێوەکردوون، تەنانەت ئەگەر سەیریشی بکەن خۆ ئەوان ئەو ناوانە ناناسن و هیچیشی لێنازانن؛ بۆیە پێویستە کتێبەکانی مێژوو لە ڕیوایەتی شیعەکان پاکبکرێتەوە، بۆ ئەوەی کە خەڵکی مێژووی ئوممەتی ئیسلامی لە سەرچاوە ڕاست و دروستەکان بخوێنێتەوە.

**نۆیـــەم:**

خەڵکێکی زۆر هەیە کە گوێ ناداتە ئەو ئەرکەی کە بەرامبەر بە شیعەکان لەسەر شانمانە! ئایا چ ژیری و حیکمەتێك لەوەدایە کە ئێمە واز لە سەدو پەنجا ملیۆن کەس بهێنین کە خاوەنی ئەم جۆرە بیروباوەڕە گەندەڵ و خراپەبن، و بەبێ ئەوەی ئاگاداریان

بکەینەوە لە مەترسی و ترسناکی ئەوە بیروباوەڕەی کە ئەوان لەسەرین و باوەڕیان پێیەتی؟!

ئەدی پێویستیان بەوە نییە کە ئەو شیعانە فێربکرێن و بۆیان ڕوونبکرێتەوە و فەرمانیان بە چاکە و پێبکرێت و لەخراپەش ڕێگرییان لێبکرێت؟! ئەدی باشە لە ڕۆژی قیامەتێ خودای پەروەردیگاری جیهانیان لێماننناپرسێت سەبارەت بە هەڵوێستمان کاتێك بینیمان کە کەسانێك دینداری بەم شێوەیە دەکەن کە لە ووتاری ((ڕەچەڵەکی شیعەکان)) دا باسمان لێوەکرد؟!

لەڕاستیدا هەندێ لە شیعەکان کۆمەنێتیان لەسەر ئەو ووتارانە بۆ ناردووین، و تێیدا ڕوودەکەنە خودای گەورە و دوعا دەکەن کە خودا سزامبدات بەوەی لەگەڵ ئەبو بەکر و عومەر حەشرم بکات!! لەگەڵ دڵخۆشیم بەوەی کە کەسێك هەیە کە هیوای ئەوەم بۆ دەخوازێت کە لەگەڵ ئەبو بەکر و عومەر دا حەشرمبکات، بەڵام زۆریش نیگەرانیم



وێرانکردنی مزگەوتی سوننەکان

لەوەی کە دژایەتی دوو گەورە پیاوی وادەکەن کە بەڕاستی خودای گەورە هەڵیبژاردوون کە هاوڕێیەتی و هاودەمی گەورەو سەرداری پێغەمبەران بکەن (صلی الله علیه وسلم)، بەڕای من یەكێك لەهەرە ئەرکە پێویستەکانی بانگخواز و زانایانان بریتییە لەوەی کەمەترسی ئەو بیروباوەڕەی کە شیعەکان لەسەرین بۆ شیعەکانی ڕوونبکەنەوە، گومانی تێدا نییە کە کەسی حەقخوازیان تێدایە کەهەرکە زانیاری ڕاست و دروستی پێبگات ئەوا ئەو حەقەکە وەردەگرێت جا بەلایەوە گرنگ نییە هەرچ ناستەنگێکیش ڕووبەڕووی ببێتەوە.

دەیـــەم:

ئایا ئێستا کێ بەرگری لە سوننە هەژارانە دەکات کە لە ئێراندا دەژین؟! ئایە دەزانن کە ژمارەیان چەندە؟ لەڕاستیدا ژمارەیان دەگاتە نزیکەی ٢٠ ملیۆن کەس، کە نزیکەی ٣٠٪ی دانیشتوانی ئێران پێکدەهێنن، لە کاتێکدا تەنانەت یەك وەزیریشیان لە حکومەتی ئێرانیدا نییە، و ژمارەیان لە پەرلەمان لە ١٠٪ کەمترە، زیاتر لە ملیۆنێك سوننە لە تەهرانی پایتەختدا هەوڵی دروستکردنی مزگەوتێك دەدەن بۆ خۆیان، بەڵام تاوەکو ئێستا لەو هەوڵەیان فەشەلیان هێناوە، ئەمەو سەرەڕای لەناوبردنێکی ڕاستەوخۆی تەواوی ئەوانەی کە داوای مافیخۆیان دەکەن، لەناوبردنەکە گەیشتە ئەو ئەندازەیەی کە مزگەوتی سوننەکان وێرانبکرێت، لەدیارترینی ئەم ڕووداوانە، وێرانکردنی مزگەوتی شێخ فەیز بوو لە خوراسان لەساڵی ١٤١٤ی کۆچی=١٩٩٤ی زایینی، پاشان وێرانکردنی مزگەوتی بولایەی بلوشستان و پاشانیش کوشتنی زیاتر لە دوو سەد لاوی سوننە کە وەکو نارەزایەك لەبەرامبەر وێرانکردنی


لە سێدارەدانی سوننەکان

مزگەوتی شێخ فەیز خۆیان لەناو مزگەوتدا قایمکردبوو.

ڕوون و ئاشکرایە کە پەیڕەو پرۆگرامی ئەو خوێندنەی کە لایەن بیست ملیۆن سوننەوە پەیڕەودەکرێت لە ئێراندا لەگەڵ بیروباوەڕ و بنەماکانی مەزهەبی سوننی یەك ناگرێتەوە، بەڵکو لەسەر هزرو و بیدعەی شیعەکانە.

بێگومان - بەداخ و پەژارەیەکی زۆرەوە-قەیرانێکی زۆر گەورە بەرۆکی ژیانی سوننەکانی ئێرانی گرتووە، هەموو لایەکییشمان دەبینین کە هیچ نییە فرمێسکیان بۆ ببارێنێت، ئایا هەمورومان لەبەرامبەر کێشەی ئەوان و سوننەکانی عێراقدا خۆمان بێدەنگ بکەین، یاخود بێینە گۆو، بەشکەم خودای گەورە (عز وجل) دڵی کەسێك بەخەبەر بێنێت و کارێك ئەنجام بدات؟!

ئەم دە خاڵەی کە باسمان کرد بریتیبوون لەهەندێك لەو مەترسیە دیارانەی کە شیعەکان هەیانە لەسەر سوننە بەتایبەتی و ئوممەتی ئیسلامیدا بەشێوەیەکی گشتی.

خوشك و برایان ئایا هیچ ژیریەك لەوەدا دەبینن کە خۆمان بێدەنگ بکەیین؟!

ئایا شیکار وشڵۆڤەکارە ژیرەکان پێیان وایە کە زیانی قسەکردن لەسەر پرسی شیعەکان گەورەتربێت لە زیانەکانی ئەو مەترسی و واقیعەی کە ئێمە ئێستا بەکردار پێیدا تێدەپەڕین، کە لەم بەشەو بەشەکەکانی پێشووتردا باسی دە دانەمان لێکردن؟!

سەرەڕای ئەمەش، مەستمان لەباسکردنی ئەمانە ئەوە نییە کە چەکهەڵگرین،بەهۆیەوە ڕووبەڕووی شیعەکانی ئێران یان عێڕاق یان سوریا یان لوبنان ببینەوە، نەخێر، مەستمان لەو باسانە ئەوەش نییە کە بگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە مەترسی شیعەکان لە مەترسی جولەکەش زیاترە، بەڵکو مەبەستمانە کە لەڕێگەی ئەم باسانەوە بە ڕاست و دروستی لە دۆخەکان تێبگەین، ئەوکات بیرمەند و ژیرەکانی سوننە دوابەدوای زانینی ڕاستییەکان لەسەر ژیرانەترین و گونجاوترین هەڵوێست بەرامبەر بە شیعەکان ڕێکدەکەوتن.

لە ڕاستیدا بەملیۆنەها لەوانەی کەپێشنیاری خۆیان لەهەمبەر زۆرێك لە کێشە ئاڵزەکاندا دەردەبڕن هیچ شتێك سەبارت بەو پرسەی کە قسەی تێدا دەکات نازانێت، بەڵکو تەنها لەڕوانگەی بەسۆزو عاتیفەوە و واش خۆی نیشان دەدات کە قسەکانی راستن و دڵسۆزانیش زوو بەزوو جێبەجێیدەکەن.

باشە ئێستا دوابەدوای زانینی ئەم زانیاریە بریندارکەرانە، هەڵوێستمان بەرامبەر پرسی شیعەکان چی دەبێت ؟

**یەکەم:**

جمهوری زایانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە خەڵکی ئاسایی مەزهەبی شیعەی دوازدە ئیمامی مسوڵمانن، بەڵام مسوڵمانی ئایینگۆڕ و بیدعەچین، و بەشێوەیەکی گشتی هەموو ئەحکامی ئیسلامییان لەسەردا جێبەجێدەکرێت، لەوانە ژن وژنخوازی و میرات و دەفن و قەزاوەت و خواردن و گشت معامەلاتەکانی تری وەك ڕێگەدان بە ئەنجامدانی حەج و عەمرە و چوونە ژوورەوەی ئەو شوێنە پیرۆزانەی کە بۆ نامسوڵمان قەدەغەیە، بەڵام هەموو ئەمانە خراپی ئەو لەڕێ لادان و ئینحیرافاتانەیان لەسەر لانابات کە ئەوان پەیڕەوی دەکەن، کە پێویستی بە ڕاستکردنەوە و چاککردنەوە هەیە، بەڵکو پێویستی بە ئەحکام و یاسا هەیە، ئەمەش لە تایبەتمەندی وپشکی زانایانی ئوممەتی ئیسلامییە، بەکۆمەڵێك ووردەکارییەوە کە لێرەدا دەرفەتی ئەوەمان نییە باسی بکەین.

بەهەمان شێوە کۆدەنگی زانایان لەسەر ئەوەیە کە هەندێ کۆمەڵە و تاقمی شیعە هەن کە کافرن، لەسەروی هەموویاندا، شیعەکانی سەر مەزهەبی ئیسماعیلی و نوسەیریەکان، و ئەوانەی لەسەر مەزهەبی بێباوەڕانن.

دووەم:

بەپشت بەستن بەو هەموو ئینحیرافتە زۆر زەبەندانەی کە مەنهەجی شیعەکان تێیکەوتوون، ئێمە دەتوانین ئەستەم بوون و مەحالیەتی نزیك بوونەوەی بیروباوەڕی و فیقهی لەنێوان شیعە و سوننەدا ڕابگەیێنین، شیعەگەری مەزهەبێك نییە لەمەزهەبەکان، هەروەکو هەندێك کەس گۆمانیان وایە، بەڵکو بریتیە لە لادانێك لەسەر ڕاستەشەقامی ئیسلام،و هەر نزیککردنەوەیەك لە نێوان ڕاستەشەقامی ئیسلام و لەڕێلادان شتێك نییە جگەلە لەرێلادان بەهەمان شێوە، بەڵام بەشێوەیەکی کەمتر، و ئەمەش لە شەریعەتی ئیسلامیدا کارێکی خوازراو نییە.

ئایا لێکنزیکبوونەوەی شیعە و سوننە واتایی ئەوە دەگەیێنێت کە ئێمە ڕازبیین بەوەی کە جوێن بە صەحابەوە غەیری صەحابان بدرێت؟ ئایا لێکنزیکبوونەوەی شیعە و سوننە واتایی ئەوە دەگەیێنێت کە باوەڕبکەین بەهەندێك لە ئیمامەکانی دوازدە ئیمامیەکان و باوەڕەیش بەهەندێکی تریان نەکەین؟ ئایا لێکنزیکبوونەوەی شیعە و سوننە واتایی ئەوە دەگەیێنێت کە ئێمە فەرموودەکان لە ئیمامی بوخاری و موسلیم وەرگرین فەرموودەکانی ترمزی و ئەبو داودیش وازلێبێنین؟ئایا لێکنزیکبوونەوەی شیعە و سوننە واتایی ئەوە دەگەیێنێت کە ئێمە هاوسەرگیری سیغە(موتعە) لەهەندێ بارودۆخدا بەحەلال بزانیین؟ ئایا لێکنزیکبوونەوەی شیعە و سوننە واتایی ئەوە دەگەیێنێت کە ئێمە چاوبپۆشین لەئاست ئەو پێشێلکاریانەی کەلەدژی هەندێك لە سوننەکانی عێراق و ئێران و سوریا ولوبنان ئەنجامدەدرێت، بەڵام

چاونەپۆشین لە پێشێلکارییەکان دەرحەق بەشوننەکانی شوێنەکانی تر؟ بەڕاستی - خوشك و برایان - ڕێگەکە داخراوە، داخراوە!!

هەرچ هەوڵ تەقەلایەك بدرێت بەمەبەستی نزیکبوونەوەی شیعەو سوننە لە ڕووی بیروباوەڕ و فیقهی یەوە شتێك نییە جگە لە هەوڵدان بۆ گۆڕین و دەستکاریکردنی دینی ئیسلام، کەئەمەش کارێکی نابێت هەوڵی بۆ بدەین..باهەموولایەکمان بگەڕێینەوە بۆ هەڵوێستی ئەو زانایانەی کە هەوڵی لێکنزیکبوونەوەی شیعەو سوننەیان دەدا لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانیاندا، پاشان بۆیان دەرکەوت کە سەرەڕای هەوڵ وتەقەلای زۆریان شتێکی مەحاڵە کە ئەم کارە ئەنجامبدرێت، بالێرەدا باس لە زانای بلیمەت و گەورەی سوری بکەین کە ئەویش دکتۆر موصتەفا سوباعی یە (ڕەحمەتی خودای لێبێت)، کە بەڕاشکاوی سەرنەکەوتنی هەوڵەکانی خۆی ڕاگەیاند، و لە کتێبەکەی بەناونیشانی (السنة و مكانتها في التشريع الإسلامي) یە دا دەڵێت: ((.. وەکو بلێیت کە بانگهێشتەکردن بۆ لێکنزیکبوونەوە بریتی بێت لە نزیککردنەوەی مەزهەبی سوننە لەمەزهەبی شیعە!!))[1] بەهەمان شێوە زانای زۆر بەڕێز دکتۆر یوسف قەرزاویش (خودای گەورە بیپارێزێت) بەهەمان مەبەست هەوڵیدا و بەهەمان دەرئەنجام گەیشت.

---

(١) موصتەفا سوباعي: السنة و مكاتها في التشريع الإسلامي، لاپەڕە ٢٤، ضائي دار الوراق - المكتب الإسلامي.

سێیەم:

ئێمە نابێت بەمە بوەستین کە تەنها نکۆڵیبکەین لە بیروباوەر و پەیڕەو وپڕ گرامی شیعەکان، بەڵکو پێویستە لەسەرمان ئەهلی سوننەش بپارێزین بەخۆپڕچەککردن بەزانستی سود بەخش و بشیان پارێزین لەوەی کە بکەونە نێو نەگبەتی بیروباوەڕە گەندەڵەکان، و پێویستیشە لەسەر زانا و بانگخوازانیش کە خۆیان بەباشی چالاك بکەن لە ئاشناکردنی سوننەکان بەئایینە ڕاست و دروستتەکەیان و هەروەها



دکتۆر یوسف قەرزاوی

ئاشنایان بکەن بە چیرۆك و سەرگزشتەی پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم) و ئەصحابە پایەبەرزەکانی، بەهەمان شێوە پێویستە کە کەڵك لە کەلەپووره زۆرو زەبەندە مێژووییەکانی ئوممەتی ئیسلامی وەربگرین، با هەموو لایەکیش بزانێت کە ئەو گەل وئوممەتەی کە بەچاکی و بەدیقەتەوە مێژووی خۆی ناخوێنێتەوە، ئەوا ئەو ئوممەتە ناتوانێت داهاتووی خۆی بونیادبنێت.

چـوارەم:

پێویستە بەهەمان شێوە شەرم بکەین یاخود بترسین لەو گومانەی کە شیعەکان لێرەو لەوێ دەیانورژێنن، نابێت ئێمە سەری خۆمان بخەینە

ژێر گڵەوە بەگومانی ئەوەی ئەگەر خۆمان بێدەنگ بکەین لەهەمبەر قسەکردن لەسەر پرسی شیعەکان ئەوا ئەوکات ئەوان زاریان دەبەسترێت، نەخێر بەڵکو هەردەبێت بەبوێرییەوە بێینە گۆ، چونکە پرسەکە پرسی بیروباوەڕە و پرسی ڕاستکردنەوەی لەڕێلادان و ژاککردنەوەی هەڵس و کەوتوو خووڕەوشتە.

لێرەدا پێویستە لەسەرمان کە قارەمانانە دەرگای گفتوگۆ بەڕووی ئەو پرسە مێژوویە ئاڵۆزانەوە بکەینەوە کە کە شیعەکان لێیانەوە بۆمان دێنە ژوورەوە، ئەم پرسانە لە ڕوانگەی ئیسلامی ڕاست و دروستدا ڕوونیان بکەینەوە، بەهەمان شێوە پێویستە خۆشەویستی و ڕێزو تەقدیری ئەهلی سوننە بۆ ئالو بەیت ڕوونبکرێتەوە، هەروەها ئەمەش ڕوونبکرێتەوە کە ئەو گومانەی کە شیعەکان بەهۆیەوە دەستیانگرتووە بەسەر بیروهۆشی خەڵکی کە گوایە ئەوان ڕێزی زیاتربۆ ئالوبەیت دادەنێن کەلە ڕاستیدا ئەمەش گومانێکی ناڕاستە، ئەگەر نا چۆن ئالوبەیتی پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم) ڕازی دەبن کە ڕێبازی پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم) بگۆردرێت؟!

**پێنجـەم:**

پێویستە لەسەرمان کە بەدڵسۆزی و ڕاستگۆییەوە ڕووبکەینە شیعەکان و بانگیان بکەین، تاوەکو بگەڕێنەوە بۆ ئەنجامدانی بەدواداچوونێکی زانستی پاك و بێگەرد بۆ ئەوەی مێژوو و بیروباوەڕی ی خۆیان بخوێننەوە؛ بۆ ئەوەی بەڕوونی بزانن کە سەندی ڕوایەتەکانی ئەوان لەوپەڕی لاوازی و پچراندن دان، و زۆربەی پەیڕەو و

پرۆگرام و هزری شیعەکان لە سەدەی سێیەمی کۆچییدا داهێنراون، پێشتر هیچ بنەمایەکیان نەبوو. ئێمە دڵنیاین کەخودای گەورە (عز وجل) هیدایەتی دڵسۆزەکانیان بۆ سەر ڕێگەی ڕاست دەدات، و بێگومان ئەمەش لە لای خودای گەورە قورس نییە.

**شەشەم:**

پێویستە لەسەر دەوڵەتە عەرەبی و ئیسلامییەکان، و ڕەوەندی مسوڵمانان لە وولاتە ڕۆژئاوییەکاندا، کە بەووردی ئاگاداری مەترسی بە شیعەکردن ببن، کە بەشێوەیەکی ڕوولە زیاد بوون تەشەنە دەکات. هەروەکو ڕوونمانکردەوە کە ئەم بەشیعەبوونە بریتییە لە لادان لەسەر ڕاستە شەقامی ئیسلام، بۆیە لێرەدا پێویستە ئەم پرسە بەهۆشیارییەوە بەهەند وەربگیردرێت، بە تایبەتی لەو وولاتانەی کەبە شێوەیەکی چڕ تووشی بەشیعەبوون هاتووە، لەوانە بەحرێن و ئیماڕات و سعودیە و ئوردن.

**حەفتەم:**

پێویستە لەسەر ئەو سوننانەی کە لەسەر هێڵی هاوبەشن لە عێراق و ئێران و لوبنان کە زۆر هەشیار و هاودەنگ بن، پەیوەندی بەردەوامیان لەگەڵ ئەهلی سوننەدا لەسەرانسەری جیهانی عەرەبییدا هەبێت، هەروەها چاپوك و چاوکراوە بن لە پاراستنی خۆیان لەو مەترسیانەی کە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، هەروەها پێویستە لەسەریان کە لایەنی ئەو ڕاگەیاندە چالاك بکەن کە گوزارشت لە باروگوزەرانی ئەوان دەکات، و بارودۆخیان ڕووندەکاتەوە و هاوکاریکردنیان ئاسان دەکات.

**هەشتەم:**

هیچ بەربەستێت لەبەردەم بەیەکەوە ژیانی ئاشتییانەی سوننە و شیعە و ستەم لەیەکتری نەککردنی هیچ لایەکیاندا نییە، بەڵکو دەکرێت هیچ لایەکیان خۆیان نەخەنە ناو گێژاوی ململانێی هرزی و بیروباوەڕی، لەسەر ئەم بنەمایەی کە هەردوولا ئەم کارە ئەنجام بدەن، ئەمەش واتای ئەوە نییە کە هەموو مافێك بەشیعەکانی عێراق بدرێت و سوننەکانی ئەو وڵاتەش پەراوێزبکرێت، جا ئەمە چ لەعێراق بێت یان ئێران.

**نۆیـــەم:**

دەنگونجێت کە لەکتر نزیکبوونەوی سیاسی لە نێوان ئەحزابی سیاسی سوننە وشیعە دا لەسەر هەندێك پرس و بابەت ڕوویدات، بەڵام پێویستە هۆشداریيەکی تۆند هەبێت لەهەمبەر دارِمانی ئەم یەکترنزیك بوونەوەیە هەروەکو لەمێژوودا ڕوویداوە، هەروەها پێویستە هیچ تەنازولات و دەستبەردابوونێکی بیروباوەڕی وشەرعی لەپێناوی ئەم لەیەکترنزیکبوونەوەیە ڕوونەدات، پێویستیشە کە ئەم لەیەکترنزیکبوونەوەش پەیوەست بێت بەبارودۆخێکی دیاریکراو و بەرژەوەندییە دیاریکراوە هاوبەشەکانی نێوانیان، نابێت ئەم یەکترنزیکبوونەوەیە بەشێوەیەکی ڕەها بێت، تاوەکو نەبێتە مایەی نانەوەی ناکۆکی و دووبەرەکی و پشێوی لە ڕیزی مسوڵمانان، و بەریەککەوتن لە تێگەیشتن و بیروبۆچوون دا دروست نەبێت.

دەیـــەم:

بانگەوازێك بۆ هەموو كاربەدەستانی مسوڵمانانە كە لەئاستی ئەو بەرپرسیارییەتە گەورەیە دابن كە كەوتۆتە سەر شانی ئەوان، چونكە مسولمانان پەنایان بۆ بانگهێشتەكانی لەیەكترنزیكبوونەی نێوان شیعە و سوننە نەبردووە و سەرسام نەبوون بەنموونەی فەرمانڕەوایانی شیعەكان تەنها لەبەر غیاب و نەبوونی فەرمانڕەوای مسوڵمانی سوننە لە گۆڕەپانەكەدا..بێگومان بینیمان كە سوننەكان چەندە هەست و سۆزیان جولا لەو كاتەی كە ئوردوغانی سەرۆك كۆماری توركیا هەڵویستی خۆی بەرامبەر بە جولەكەكان و سەرۆك وەزیرانی دانیمارك ڕاگەیاند، ئەمەش واتا كۆدەنگی تەواوی شەقامی مسوڵمانانە تاوەكو لەپشت رەمزێكەوە بووەستنەوە، داواكارم لە خودای باڵادەست (عز وجل) كە حەق و ڕاستیتان وەك خۆی پیشان بدات و بتانكات بە شوێنكەووتەی ئەو حەق و ڕاستییە، هەروها ناڕاستی و ناحەقیشتان وەك خۆی پیشان بدات و دووریشتان بكاتەوە لە شوێنكەوتنی ئەم ناڕاستی و ناحەقییە.

ئەمەش بریتی بوو لە خاڵی دەیەم لە بیروبۆچوونی ئێمە لەهەمبەر ئەم پرسە مەترسیدارە، ئەمەش تەواوی دە خاڵەكە بوون.

من هیچ گومان لەوەدا نییە، كە بەدەیان و سەدان، تەنانەت هەزارەها پرسیار هەن كە بۆمان نەگونجا لەم چەند لاپەڕە دیاریكراو و خێرایە دا ئاماژەیان پێبكەین، بەڵام ئێمە تەنها ویستمان دەرگاكان بكەینەوە و دیدگەكان ڕوونبكەینەوە، بەڵام هەرچ درێژە پێدان و ڕوونكردنەوەی تێروتەسەلی یە پێویستی بە ئەنجامدانی دراسەكردن و توێژینەوەی زۆر هەیە، كە داواكارین لە خودای پەروەدگار كە زانای مسوڵمان

سەرکەوتوویکات بۆ ئەوەی بەم کارە هەڵسن، بۆ ئەوەی ڕاستییەکان بۆ خەڵکی ڕوونبکەنەوە:

﴿ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِۚ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴾ سورەتی الأنفال: ٣٩.

واتە: (بۆئەوەی خەڵکی تووشی ئاشووب و فیتنەی بێدینی و شیرك نەبن، و تەواوی دینداری خودا پەرستیەکانیشان تەنهاوتەنها لە پێناوی خودای گەورە دا بێت.) خودای گەورە گەل و ئوممەتی ئیسلامی لەهەموو بەڵا و ئاشووبێك بپارێزێت و ڕاستە شەقامەکەی بۆ ڕۆشنبکاتەوە و لە خێرو بێری دونیا قیامەت بێبەشی نەکات. دەپاڕێینەوە لە خودای گەورە (عز وجل) کە ئیسلام و مسوڵمانان بە عیزەت و شۆکۆدار و سەر بەرزبکات.

# دوا وتــه

ئایا سەبارەت بەم بابەتە، تێنیویەتی دەروونیتان شکا؟ ئایا فێری ئەو شتە بوون کە دەتانویست فێری ببن سەبارەت بە پرسی شیعەکان؟ من بۆ خۆم پێم وانییە کەوا بێت. خۆی لەخۆیدا پرسەکە پرسێکی زۆر پڕلق و پۆپ و ئاڵۆزە، ئێستا نوسینی زۆریش نووسەری بەتوانا و سیاسەتمەداران و زاناکان سەبارەت بەم پرسە هەیە، ئەمەش خوێنەر توشی تەشویش دەکات و پرسیار لە دوای پرسیار لە مێشکیدا دروست دەکات. باشە ئەدی چارەی چییە؟! چارەسەرەکەی بریتیە لەوەی کە بەم نزیکانە کتێبکم بەناونیشانی چیرۆکی شیعەکان ((قصه الشیعه)) دەردەچێت، هەروەکو لە پێشەکی دا ئامژەمپێکرد، لەم کتێبەدا بە پشتیوانی خودای گەورە بە فراوانی دوورو درێژی ئەم پرسە تاوتوێ دەکەم، بۆ ئەوەی وێنەکە باشترو ڕوونتر بۆ خەڵکی بەدیار بکەوێت.

خوێنەری ئازیز، تۆش دەتوانیت لە دەرکردنی ئەم کتێبە بەشدار بییت بەباشترین شێوە، ئەویش لە ڕێگەی ناردنی پرسیار و وەڵامەکانتان بۆم سەبارەت بە بابەتی شیعەکان، ئەو پرسیارانەی کە لە کتێبی ((شیعەگەری، تێکۆشانە یان گومڕایی؟!)) وەڵامەکەیتان دەست

نەکەوت، بێگومان ئەم پرسیارانەش کتێبی((چیرۆکی شیعەکان)) دەوڵەمەند دەکات بەشێوەیەکی لێدەکات کە دڵ و دەرونتان ئاسودەتر دەکات. بۆ ئەم مەبەستە دەکرێت پرسیارەکانتان لەسەر ماڵپەرەکەی من لەسەر ئینتەرنێت (ماڵپەری چیرۆکی ئیسلام islamstory.com) ڕەوانە بکەن، خودای گەورە پاداشتان بداتەوە. بێگومان ئێستا ئوممەتی ئیسلامی لە قەیرانێکی گەورەی جیاجیا دا دەژییێت، هەرگیزا و هەرگیزیش باروگوزەرانی ئەم ئوممەتە بەهیچ شتێك چاك نابێتەوە تەنها بەو شتە نەبێت کە سەرەتا ئەم ئوممەتەی پێچاك بووەوە، بۆیە با بۆ کتێبەکەی خودای گەورە و سوننەتی پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) وبیروباوەڕی راست و دروست و بیرو هزری ساغ وسەلیم بگەڕێینەوە، ئەو کات بە پشتیوانی خودای گەورە عیززەت و سەربەرزی و سەرکەوتن بۆ ئەم ئوممەت دووبارە دەگەڕێتەوە.

دەپاڕێینەوە لە خودای گەورە (عز وجل) کە ئیسلام و مسوڵمانان
بە عیزەت و شۆکۆدار و سەر بەرزبکات..

# نـــاوەڕۆك



## پرۆفیسۆر دکتۆر ڕاغیب سیرجانی

پرۆفیسۆر دکتۆر ڕاغیب سیرجانی: لەساڵی ١٩٦٤ی زاینی لە وولاتی میسر لەدایك بووە، لەساڵی ١٩٨٨ی زاینیدا لەكۆلێژی پزیشكی زانكۆی قاهیرە بەكالۆریۆسی بەپلەی نایاب و نازناوی شەرەف بەدەست هێناوە، لە ساڵی ١٩٩١ی زاینیدا تەواوی قورئانی پیرۆزی لەبەر كردووە، پاشان لە ساڵی ١٩٩٢ی زاینیدا ماستەر بەپلەی نایاب لەهەمان زانكۆ تەواو دەكات، دواتریش لە ساڵی ١٩٩٨ی زاینیدا بەشێوەی سپلت سایت (بەسەرپەرشتیاری هاوبەشی نێوان زانكۆی میسری و زانكۆی ئەمریكایی) دكتۆرا لە بواری نوژداری میزەڕۆ و كلیەكان بەدەست دەهێنێت.

**ئێستا نوسەر:**

- مامۆستایە لەكۆلێژی پزیشكی زانكۆی قاهیرە.
- ئەندامی یەكێتی جیهانی زانایانی موسڵمانانە.
- سەرۆكی ئەنجومەنی سەنتەری شارستانیە بۆ دیراساتی مێژووی لە قاهیرە.

• خاوەنی بیرۆکەی ماڵپەڕی ((قصة الإسلام))ە، لەهەمانکاتدا سەرپەرشتیاری ئەم ماڵپەڕەشە (کەگەورەترین ماڵپەڕە کە تایبەت بێت بە مێژووی ئیسلامی) www.islamstory.com.

• توێژەر و بیرمەندی ئیسلامی یە، کە گرنگیەتی تایبەت بە مێژوویی ئیسلامی دەدات.

## پڕۆژە فیکریەکەی

پڕۆەی فیکریەکی کە دەرهاویشتەی ((معا نبني خير امه)) واتا((با پێکەوە باشترین ئوممەت بنیاتنێین)) لێکۆڵینەوەو دیراسەکردنێکی وورد و ساناى مێژووی ئیسلامییە، ئەویش بە مەبەستی چەند ئامانجێك، لەوانە:

• هەڵێنجانی فاکتەرەکانی هەڵسانەوەی ئوممەت و کەڵك وەرگرتن لەم فاکتەرانە لە دووبارە بونیادنانەوەی ئوممەتی ئیسلامی.

• زیندوکردنەوەی هیوا لەناخی مسوڵماناندا، هاندانیان لەسەر بەدەستهێنانی زانستی بەسود و کاروکردەوەی بونیادنەر بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکان.

• پاککردنەوەی مێژووی ئیسلامی و بەدیارخستنی ڕووە شارستانیەکەی لەمێژووی ئیسلامیدا.

هەروەها لەماوەی ساڵانی ڕابردوو چەند کار و چالاکییەکی زانستی و بانگخوازی ئەنجامداوە، ئەمەش بە پێشکەشکردنی ووتار و کتێب و ووتار و شیکردنەوە، هەروەها لەڕێگەی گەشتەکانی بۆ وولاتە جیاجیاکانی سەرتاپای جیهاندا.

## ڕادیۆ و کەناڵە ئاسمانییەکان:

نووسەر ئێستا چەندین بەرنامە و مێزگرتێکی جیاجیا لە کەناڵە ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنە ئاسمانییەکانی وەکو: اقراء، الرسالة، الحوار، الناس، القدس، المستقبل، العربية، الجزيرة، الجزيرة المباشرة، السودان، ئیزاعەی ام القيوين، ئیزاعەی القرآن الكريم لە فەڵەستین و ئوردون و لوبنان و سودان و ئیمارات و چەندین وولاتی تر.

## تومارەکانی

خاوەنی سەدان ووتار و شریتی ئیسلامیە، کە تێیاندا باس لە بەسەرهات و ژیاننامەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەصحابانی دەکات، هەروەها باس لە مێژوویی ئەندەلوس و چیرۆکی تەتارەکان،و چەندانی تر دەکات.

## ئەو خەڵاتانەی بەدەست هێناوە:

١- خەڵاتی ناوەندی ئیسلامی بۆ بانخوازانی یەکتاپەرستی و سوننە لە ساڵی ٢٠١٠ی زاینی.

٢- خەڵاتی میری بۆ ڕێزلێنان (خەڵاتی ئەنجومەنی باڵا بۆ کاروباری ئیسلامی ) لە ساڵی ٢٠٠٩ی زاییني.

٣- خەڵاتی یەکەم لە پێشبرکێی بەرنامەی جیهانی بۆ ناساندنی پێغەمبەری ڕحمەت (صلى الله عليه وسلم) لە ساڵی ٢٠٠٧ی زاینی.

## کتێبـەکانی

تاوەکو ئێستا ٤٥ کتێبی دکتۆر ڕاغیب سیرجانی کەوتۆتە بەر دیدی خوێنەرانەوە، کتێبەکانیش سەبارەت بە مێژوو وهزری ئیسلامین، ئەمانیش بریتین لەمانەی خوارەوە:

١- أسوة للعالمين (من هو محمد (صلى الله عليه وسلم) ؟)
٢- ماذا قدم المسلمون للعالم..إسهامات المسلمين في الحضارة الإسلامية
٣- الرحمة في الرسول (صلى الله عليه وسلم)ز
٤- المشترك الإنساني..نظرية جديدة للتقارب بين الشعوب
٥- فن التعامل النبوي مع غير المسلمين
٦- قصة الأندلس من البداية الى السقوط
٧- قصة تونس من البداية الى ثورة ٢٠١١م
٨- قصة الإمام محمد بن عبدالوهاب رحمه الله
٩- الشيعة..نضال أم ضلال؟! (ئةوةي لةبةردةستتداية)
١٠- قصة التتار من البداية الى عين جالوت
١١- قصة الحروب الصليبية من البداية إلى عهد عماد الدين زنكي
١٢- العلم و بناء الأمم-دراسة تأصيلية في بناء الدولة وتنميتها
١٣- روائع الأوقاف في الحضارة
١٤- أخلاق الحروب في السنة النبوية
١٥- قصة العلوم الطبية في الحضارة الإسلامية
١٦- فلسطين.. واجبات الأمة

١٧- وشهد شاهد من اهلها
١٨- رحماء بينهم - قصة التكافل والإغاثة في الحضارة
١٩- بين التأريخ والواقع - (لقضوار بقرطداية)
٢٠- و خلق الإنسان ضعيفا
٢١- نقطة من أول السطر
٢٢- رمضان و نصر الأمة
٢٣- أمة لن تموت
٢٤- رسالة إلى شباب الأمة
٢٥- كيف تحافظ على صلاة الفجر
٢٦- كيف تحفظ القرآن الكريم
٢٧- القراءة منهج حياة
٢٨- المقاطعة..فريضة شرعية وضرورة قومية
٢٩- أخي الطبيب قاطع
٣٠- أنت وفلسطين
٣١- فلسطين لن تضيع..كيف؟
٣٢- لسنا في زمن أبرهة
٣٣- إلا تنصروه (صلى الله عليه وسلم)
٣٤- التعذيب في سجون الحرية
٣٥- رمضان و بناء الأمة
٣٦- الحج ليس للحجاج فقط
٣٧- من يشتري الجنة
٣٨- أسلاك شائكة

٣٩- الفتنة الطائفية في مصر..الجذور.. الواقع..المستقبل
٤٠- كيف تختار رئيس الجمهورية
٤١- رمضان الأخير
٤٢- قصة أردوغان
٤٣- مستقبل النصارى
٤٤- الحج و العمرة..أحكام وخبرات
٤٥- أنت و الصومال.

کۆتـــایی

اخر دعوانا ان الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.
وصلاة وسلام على نبينى محمد